بسم الله الرحمن الرحيم

# ناسنامەی کتێب




ناوی پەرتووک: "سارێژی برینەکان لە ئیسلامدا "

نووسەر: " عبدالله خاکی "

پێداچوونەوەی: "ڕەنج شێخانی"

دیزاینی بەرگ: " عوسمان محمد "

دیزاینی ناوەوە: "عبدالله خاکی"

نۆرەو ساڵی چاپ: " یەکەم ٢٠١٩،١٤٤١ "

چاپخانەی: " حاجی قادری کۆیی"

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپیاردنی (٩٢٩) ساڵی (٢٠١٩) پێدراوە






# پێشکەشە



* بــەوگــەنج ولاوانــە تەمــەنی خۆیــان تــەرخان کــرد بــۆ ئیســلام و گەڕانەوە بۆلای خوا بە سەربەرزی.
* بەوانــەی خــەمخۆری ئــەم ئیســلامەن هــەموو کــات هــەوڵــی بڵاوکردنەوەی ئەدەن تا بەڵێنی خوا دێتەدێ.
* بەوانــەی ســەرڕاســتانە شــوێنکەوتەی پێغەمبــەری خۆشەویســتن ﴿ﷺ﴾ وشوێن پێ هەڵگری ئەون بست بەبستێ.
* بــەوبانگخوازانــەی سەرخســتنی ئیســلام بۆتــە غــەمیان لــە داخ و حەسرەت پیری کردوون.
* بــەوانــەی قوتــابی قورئــان وســوننەتن ئیســلام دەکەنــە ڕێبــازی ژیانیان تاکو دوارۆژێکی گەش بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەرکەن.
* بــەودایــك وخوشــکانەی ئامــادەنین جلــی شــەرم وشــکۆ داکــەنن تەنها بۆ خودا ئەژین.
* بــەوبــاوك ودایکانــەی هــەرلــەزووەوە دڵــی منداڵــەکانیان بــە ئیمــان و قورئــان ئــاوئــەدەن تابیانخەنــە ژێــر ڕەزامەنــدی خــواو بەهەشــتی پان و بەرین.

خاکی





بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفَرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِأنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ و أنتُمْ مُسلِمونَ.

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً و اتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيبَاً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْلَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَفَوزاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصَدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَالهَدِي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم، وشَرَّالامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍ فِي النَّارِ



# پێشەکی مامۆستا: ڕەنج شێخانی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين المبعوث رحمة للعالمين محمد(ﷺ) وعلى آله وصحبه أجمعين.

لەپاشاندا:

سوپاس و ستایشی خوای بەسۆز و بەبەزەیی دەکەم، کە ئەم جارەش فەزڵی ئەوەی پێ بەخشیم پێداچونەوەیەك بۆ ئەم پەرتوکە نایاب و بەپێزەی کاکە عبداللە خاکی بکەم، پێش گەیشتنی بەخوێنەرانی ئازیزو خۆشەویست سارێژی برینەکانی ئەم بەندە تاوانبارە بکات و بە کۆمەڵێك ئامۆژگاری شەرعی و یادخستنەوەی قیامەتی بەسوود، دڵ و دەرونمان ئارام و ئاسودە بکات و خوای گەورە لەجێی گومانی باشی بەڕێزیان دا حسابمان بۆ بکات، کە ئەمە بۆ دووەم جارە داوای پێداچونەوەی پەرتوکەکانیم لێ دەکات کە لەڕاستی دا خۆم بەشیاوی ئەوە نابینم و نازانم، بەڵام کاتێك کە جوهدو توانای ئەم برایە دەبینم دەمەوێت زیاتر هاندەریان بم لەو کارە خێرەی دەستی داوەتێ.

ئەوەی کەجێی بایەخە باسی بکەم لەم پەرتوکەدا دەست خستنە سەر زۆرێك لە ئازارو کێشەو ناڕەحەتیەکانی نێو ژیانی تاك و خێزانی کوردە، کەبەهۆی دوورکەوتنەوەیان لەبەرنامەی پاك و بێ گەردی پیرۆزی ئیسلام، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ قەیرانی خراپترو ناڕەحەتی و ئاژاوەی گەورەتر بەرۆکی ئەومیللەتە دەگرێت و ئەوەی کەجێی داخە لەجیاتی چارەسەری کێشەو ڕووداوێك هەر زۆر بەزوویی کێشەو ڕووداوێکی خراپتر ڕوو دەدات کەئەوی پێشتر لەبیردەباتەوە ناشتوانرێت چارەسەری حەتمی بۆ ئەو هەموو کێشەو قەیرانانە بدۆزرێتەوە،




بەهۆی ئەوەی ئەو ڕێگەیەی کەهەوڵی چارەسەری کێشەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵگەی پێ دەدرێت سەر لەبەریان داتاشراوی دەستی مرۆڤەو لەجیاتی چارەسەرا، کێشەکە ئاڵۆزترو خراپتر دەکات.

هەر بۆیە لەم پەرتوکەدا کاتێك باسی هەر کێشەیەك کرابێت ئەوە زۆر بەجوانی لەدەرمان خانەی قورئان و سوننەت بەتێگەشتنی پێشینە چاکەکانی ئوممەت· چارەسەرەکەیشی باس کراوە.

هیوادارم برایان و خوشکانی بەڕێزم لەگەنج و لاوەکان تا دایکان و باوکان بەگرنگی یەوە ئەم پەرتوکە بخوێننەوە تاوەکو زیاتر بەئاگابن و لەفرت و فێڵەکانی نەفس و شەیتان و سەرجەم ئەوکەس و لایەنانەی کەدەیانەوێت گەنج و لاوەکانمان دوور بخەنەوە لەبەرنامەی پیرۆزی ئیسلام و داب و نەریتی جوانی کوردەواری و لەهەوڵی داڕمانی ڕەوشتی تاك و کۆمەڵگەو هەڵوەشاندنەوەی خێزانی موسوڵمانان دان، و ئەگەر واش بڕوات ڕەوشەکە خراپتر دەبێت و، بۆیە ئەگەر دەتانەوێت چارەسەری سەرجەم کێشەو نارەحەتیەکانیان بکرێت ئەوە بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ تاوەکو بەختەوەری دونیاو دواڕۆژ بن.

داواکارم لەخوای گەورە نمونەی کاکە عبدالله خاکی زیاد بکات کەلەم تەمەنە گەنجیەتیەی دا وەك ئەرکێکی قیامەتی لەخەمی براو خوشکە گەنج و لاوەکان و سەرجەم دایکان و باوکانی موسوڵمان و خێزانە بەڕێزەکانی کۆمەڵگەکەی دایە داوایان لێ دەکات کە وریای خۆیان بن، و ئەو شاڵاوە فیکری و داگیرکاریەی کەسەرجەم وڵاتانی گرتۆتەوەو بۆتە هۆکاری لاوازکردنی پەروەردەی ڕەسەنی ئیسلامەتی ئەوانیش لەگەڵ خۆیدا پەلکێش نەکات و،




بۆخوا ژیان و بۆخوا سوڵحان لەم سەردەمی فیتنەیەدا ڕێگەی هەمووان بێت تا سەربەرزانە دەگەڕێینەوە خزمەتی خوای پەروەردگار.

لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە بەباشترین پاداشت پاداشتی خێری کاکە عبدالله بداتەوەو ئەم پەرتوکەی بۆ بکاتە توێشوی دوارۆژی و، جێگای ڕەزامەندی خوای گەورەو پاشان ببێتە هۆکارێکیش بۆ هیدایەت و ڕێگا ڕۆشن کەرەوەی ئەو خێزان و گەنج و لاوانەی کە کەوتوونەتە ناو تاوان و کێشەو ئاژاوەو و نازانن پەنا بۆ کوێ بەرن و چۆن چارەسەری کێشەکانیان بکەن و سوود لەسەرجەم ئامۆژگاری و یادخستنەوەکانی ناوی ببینن.

لەگەڵ ڕێزی برات:

ڕەنج شێخانی

٢٠١٩ / ٠٧/٢١

یەك شەمە







# پێشەکی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمدللّهِ رب العالمين الصـلاة والسـلام على قائد المرسـلين محمد (ﷺ) وعلى اله و أصحابه ومن تبعه بإحسان إلى يوم الدين.

رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ. أمابعد:

لە پاش وەفاتی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)باشـترین ئامۆژگاری و ڕێنمای بۆ مرۆڤەکان و بەتایبەت بۆ ئیمانداران، تاوەکو ژیانیان خۆشـبێت و دووربن لەناخۆشـی و بەختەوەر بژین، تەنها قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرن (ﷺ)

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوابَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّتِي)[1] واتە: دوو شـتم لە ناوتاندا بەجێ هێشـتووە ئەگەر دەسـتی پێوە بگرن هەرگیز گومرانابن ئەویش: قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی منە.

بۆیە هەر فەرمانێك لە قورئان و فەرموودە سـەحیحەکان هاتبوو، پێویسـتە موسـوڵمان ملکەچی بێت و جێبەجێیان بکات، تاوەکو لەبری بەندایەتیمان بۆ خوای گەورە ژیانێکی خۆش لە دونیا، لە قیامەتیش بەهەشتمان پێ ببەخشێت.

داوا لە خوێنەری بەرێز دەکەم، بەوردی ئەم چەند ئامۆژگارییە بیخوێننەوە، بەندە وەکو برایەکی دڵسـۆز هەموو هەوڵێکماندا تاوەکو ئەم چەند ئامۆژگاریەمان نووسی و خستمانە خزمەتتان، بۆ ئەوەی لەم ژیانەی دونیا سەربەرزانە بژین و بمرین.

خوێنەری خۆشەویست ئەم کتێبەی بەردەستت پێکهاتووە لە چەندین بابەتی کورت و پوخت بە پشت بەستن بە سەرچاوەی قورئان و فەرموودە پیرۆزەکان،

[1] - أخرجه الدارقطني في "السنن" (٢٤٥/٤) ، والبزار في "مسنده" (٨٩٩٣) ، والحاكم في "المستدرك" (٣١٩) ، و أبو بكر الشافعي في "الغيلانيات" (٦٣٢) ، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٢٠٣٣٧)

زۆربەی کێشەکان کە لەژیانی مرۆڤەکان دێتە ئاراوە ڕوونمان کردۆتەوە بە زمانێکی پاراو تاوەکو سوودی هەبێت و بە جوانترین شێوە لێی حاڵی بن و تێبگەن.

ئێمە بۆئەوە دەستمان نەداوەتە ئەم نووسینە تاکو نازناوی نووسەرمان هەبێت، یاخود بۆئەوەی بڵێن نووسینەکە کاریگەرە!، یان خۆمان بهێنینە ڕیزی نووسەران بۆ فیزو شانازیکردن، بەپێچەوانەوە تاکە هیواو ئاواتمان ڕەزامەندی خودای گەورەیە، جا هەر ڕەخنەو قسەیەك دەکرێت دەربارەی کتێبەکە لامان ئاساییە، ئەوەی گرنگە لامان خوای گەورە لێمان قبوڵ بکات، پاشان کەسێك سوود ببینێت و ببێتە هۆی هیدایەتی بۆ سەر ڕێگای ڕاست بەهۆی نووسینەکەوە ئەوە ئامانجی سەرەکیمانە بەئیزنی خودا.

تەواوی هەموو باسەکانی ئەم پەڕاوە هەڵقوڵاوی کێشە و ناخۆشیەکانی ئەم سەردەمی غوربەت و بێنازبوونی ئەم ئیسلامەیە، کە چۆن ناحەزانی بەگشت شێوەیەك دەیانەوێت ڕووناکی و نوری خودای مەزن بەهەموو هەوڵ وتێکۆشانیان بکوژێننەوەو لە ڕێگای ساردکردنەوە و دوورخستنەوەی موسوڵمانان، بەڕاستی دڵمان ژان دەکات خەو و خۆشیمان لێبڕاوە، لەغەم و ناسۆرو میحنەتی ئەو ئیسلامە پیرۆزە کەلەم ڕۆژگارەدا بێ پەرژین و نامۆیە، زۆر بەداخەوە زۆرینەی ئەوانەشی خۆیان بە شوێنکەوتووی دەزانن، بێوەفان و پشتیان لێی کردووە و قەدری ناگرن، لەو لاشەوە دووژمنان بەهەرچی ڕق و کینەی دڵیان بەهێزی فیکرو هزر دژایەتی دەکەن، موسوڵمان دووردەخەنەوە و ساردیان دەکەنەوە لە ئیسلام.

پاشان وریاکەرەوەیەکی لە ناکاوە، بۆ ئەو کەسانەی دەستیان لە قیامەت شوشتووە، هەر بۆ دونیای کاتی تێدەکۆشن!، بەرۆکیان ئەگرێ بەهێز ڕایان ئەچڵەکێنێ دڵیان دێنێتە لەرز، هەوڵی بەئاگا هێنانەوەیان ئەدات، بۆ ڕۆژێك نەباوك سوودی هەیە بۆ منداڵەکەی و نەمنداڵیش بۆباوکی، پێیان ئەڵێ: لە غەمی تۆداین بۆ قیامەتت غەمبار و بێتاقەتین، جێی داخ نیە تۆ ڕێگای ئیسلامت ونکردوە؟.

هاوڕێکانت هەمووی پەروەردەی قوتابخانەی ئیسلامن بەڵێنی بەیەك گەیشتنیان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر حەوزی کەوسەرە!،





جێی داخ نیە کاتێك بەرەو لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەچی فریشتەکان ناهێڵن نزیك پێغەمبەر (ﷺ) بکەویتەوە؟، بەهۆی ئەوەی لە دونیا شوێنکەوتەی ڕێبازی ئەو نەبووی بەڕاست و دروستی!. دایکە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەیفەرموو: (إِنِّي عَلَى الْحَوْضِ أَنْتَظِرُ مَنْ يَرِدُهُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، فَلَيُقَطَّعَنَّ رِجَالٌ دُونِي، فَلَأَقُولَنَّ: يَا رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي، فَلَيُقَالَنَّ لِي: إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ، مَا زَالُوا يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ)[1]. واتە: من لە سەر حەوزی (کوثر) دەوەستم و سەیر دەکەم تا بزانم کێ لە ئێوە (موسوڵمانان) دێن بۆ لام، بۆیە کەسانێك دەیانەوێت بێن بۆ لام بۆ سەر حەوزی (کوثر) بەڵام ڕێیان لێ دەگیرێت و ناهێڵرێت بێنە سەری، منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئەوانە لە منن و لە ئوممەتی منن (موسوڵمانن)، لە و کاتەدا دەگوترێت: ئایا دەزانیت ئەوانە دوای تۆ چییان کردووە، بەردەوام پاشە کشێیان دەکرد لە دینەکەت و پاش گەز دەبوونەوە، بیربکەوە لەوکاتەدا چی بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەڵێن: تۆ نازانی لە پاش تۆ وازیان لە بەرنامەکەت هێنا و گوێرایەڵی فەرمانی خوای گەورە نەبوون، لە پێناو خۆشی دونیا ڕێگا ڕاستەقینەی ئیسلامی وونکردبووا!. بۆیە دەمەوێ سواری کەشتی کاروانی چاکەکاران بیت کەبەرەو بەهەشتی پان و بەرین هەنگاو دەنێ.

بەپشتیوانی خوای گەورە ئەم کتێبە تۆفانێکە بەبای بەهێزی ئیمان ڕێگەی گومڕایی لەبنەچەدا ڕەگ و ڕیشاڵی ئەپسێنێت، پەروەردەیەکی ئیسلامی ڕەسەنی پێشکەش بە موسوڵمانان دەکات، ئەیانکات بە قوتابی قوتابخانەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) کە ببنە نمونەی ئیمانداری بۆ خوا سوڵحاو، بەشێوەیەک ژیان بەرێتە سەر کەنیەتی تەنها بۆ خودا یەکلایی بکاتەوە و، گشت کارێکی بۆ ڕەزامەندی خوای گەورەبێت، تاوەکو لەم دونیا کاتییەدا بە ژیانێکی خۆش و بەختەوەر کاتەکانمان بەرینەسەر و سەرئەنجام بەهەشتی بەرین جێگاو مەکانی هەمیشەیمان بێت.

---

[1] - (رواه أحمد ( ٤١ / ٣٨٨ ) وصححه المحققون.





پاشان هەوڵی بانگکردنی موسوڵمانانمان داوە، بۆسەر لەنوێ دەستگرتن بە ئیسلام و خۆ تەسلیم کردن بەخوای گەورە، چونکە تاکە ڕێگا بۆ خۆشبەختی دونیا و دواڕۆژ تەنها گەڕانەوەیە بۆسەر ڕێبازی ئیسلام.

بەکورتی و پوختی لەم کتێبەی بەردەستت دەرمانی زۆرێك لەدەردەکانی تێدا دەست دەکەوێت، ئەو دەردانەی دەرمانەکانیان نیە ونن و دەست ناکەوێت!، لەم کتێبە دەرمانی برینە سەختەکانی تێدایە و چارەسەری بۆ داناون، بە قورئان و فەرموودە پیرۆزەکان، بەتایبەت ئەو فەرموودانەی (بوخاری و موسلیم) ڕیوایەتیان کردوون، کەڕاسترین کتێبن لەدوای قورئانی پیرۆز، وەفەرموودەی حەسەن کە زۆر بەکەمی بەکارم هێناوە، هەروەها هیچ فەرموودەیەکی لاوازمان بەکارنەهێناوە.

لەکۆتاییدا: چاوپۆشی و پەشیمانی دەردەبڕین لە خودای گەورە بۆ هەر هەڵەو ناتەواویەك لەم نووسینە گەر هەمان بێ، چونکە هەر خوایە بێ هەڵەو کەم و کورتی، داواکارم لە خوای گەورە بە گەورەی خۆی ئەم ماندوو بوونەمان لێ قبوڵ بکات، وە خۆشەویستی خۆیی و پاشان پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ و ئیسلام و ئیمان و تێکۆشەرانی لەهەر کوێیەکی ئەم زەویە هەن لە دڵ و دەروونمان دا زیاد بکات و، ڕەگو ڕیشاڵی مەبەستە دونیاییەکان لە دڵمان خاڵی بکات و، عاقیبەت خێر و دامەزراوی ڕێگای راستمان پێ ببەخشێت.

رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ.

بەندەی هەژار و هەمیشە ئیحتیاجی خودای گەورە: عبدالله خاکی

٣ رەجەبی ١٤٤٠ ی کۆچی

٢٠١٩/٣/١٠ زاینی

یەك شەمە





# سارێژی برینەکان لە ئیسلامدا.

تاکە بەرنامە یەك هەبێت لەم ژیانەی دونیا تەنها ئیسلامە کەچارەسەری گشت کێشەو گرفتەکانی کۆمەڵگای گەلان بکات، بۆ هەموو سەردەمێ دەرمانی گشت دەردەکانە بۆ سەر ڕووی ئەم زەمینە.
گەر مرۆڤایەتی لە ڕاستی و حەقیقەتی بەرنامەی خوای گەورە تێبگەشتنایە، ئەوە هیچ کات ئیسلامیان پشتگوێ نەئەخەست و هەموو هەوڵێکیان ئەدا، بۆ ئەوەی یاسا و ڕێساکانیان جێبەجێ بکردایەو، بەهیچ شێوەیەك دوور نەئەکەوتنەوە لەئیسلام وڕازی دەبوون کە تاکە بەرنامەو ڕێنیشاندەریان بێ و ئەیان پاراست بە گیان و ماڵ و ژیانیان.
بەڵام بەداخەوە مرۆڤایەتی و موسوڵمانیش تاکە شتێك هەبێ لایان کە زۆر غەمی لێنەخۆن و پشتگوێ خرابێت و بەلاییانەوە گرنگ نەبێت بەرنامەی ئیسلامە، بەڵام بۆ شتە دونیایی و بێسودەکانی ژیان زۆر بەغەم و پەژارەن، ئەگەر بێت و لە یاری تۆپی پێ ئەو یانەی خۆشی دەوێ بدۆڕێ هیچ کات لەبیری ناکات و، بەدرێژای تەمەنی لە بیریەتی لە بیرو هەستی ناڕوات، دەڵێ لە فلانە ڕۆژ و بەرامبەر فلانە یانە شکستی هێناوە، یاخود کاتژمێرێکی جوانی لێ ون بووە کەچی قەد لەبیری ناچێت و خەمی پێ دەخوا، یان ڕۆژێك لە ڕۆژان کچێکی جوانی دیوە لەبیری ناکات هەموو کات لای هاوڕێکانی باسی دەکات کەهیچ کاتێ کچی لەو جوانتری نەدیوە!، ئەمانەو چەندان شتی تری بێسودی دونیایی لەبیر ناکات، بەڵام بەرنامەیەك کە ئیسلامە پابەندبوون پێیەوە سەرفرازی و خۆشبەختی دونیا و قیامەتی پێوە بەندە، کەچی ئێمەی مرۆڤ لەبیرمان کردووە، هیچ گرنگی پێنادەین کە فێری یاساو ڕێساکانی ببین.
ڕەحمەتی خوای گەورەت لێبێت، چاك بزانە ئەم دونیایە ژیانێکی تاڵ و بێ بەهایە و بەبێ ئیسلام هیچ خۆشی و لەزەتێکی ڕاستەقینەی نیە بۆ مرۆڤایەتی.





مرۆڤ بەدیهێنراوی خودای بەدیهێنەرە، هەرخۆشی مافی یاسا دانان و فەرمانپێکردنی مرۆڤەکانی هەیە بۆ هەر شتێک خۆی ویستی لێبێت، هەر خۆی شایەنی هەڵبژاردنی بەرنامەیە بۆ مرۆڤەکان تاکو لەژیاندا بژین. هەروەك خودای گەورە دەفەرمووێت:
﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ﴾[1]. واتە: ئایە خودایەك کە خۆی دروستکراوەکانی دروست کردووە ئاگای لە خۆیان و نهێنیەکانیان و دڵیان نیە، بێگومان ئاگای لێیانەو خۆی شارەزاترە بە دروستکراوەکانی کە چ یاساو ڕێسایەك بۆیان گونجاو و شیاوە، ئەوەی بۆ هەڵبژاردوون.
بەڵێ براو خوشکانم ئەم ژیانەی دونیا بەبێ بەرنامە و یاسا بەڕێوە ناچێت، دەبێت هەر ڕێسایەك هەبێت بۆ مرۆڤایەتی تاکو ژیانی بەبێ کێشە بەڕێبکات، هەموو شتێك کە لە دونیا بوونی هەیە یاسای خۆی هەیە چۆن کاربکات تاکو بمێنێتەوە.
بۆنمونە: کۆمپیوتەر کە دەیکڕی کتابێکی لەگەڵە باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی کراوە، ماوس بۆ ئەوە بەکاردێ، کیبۆرد بۆ نوسین بەکاردێ، ئەو دوگمەیە بۆ گەورەکردنی نووسین و ئەوە بۆ تۆخکردن و ئەوە بۆ کوژانەوە، یان زۆر بەکارهێنانی لەسەر شەحن پاتریەکەی لەکاردەکەوێ و دەسووتێ، ئەمە هەموو یاسای کۆمپیوتەرەکەیە، ئینجا ئەگەر بێتو بەبێ یاساو لێزانین بەکاری بهێنین زوو خراپ دەبێ و لەکار دەکەوێ.
بۆیە خوای دروستکەری ئەرز و ئاسمان دەزانێ چ بەرنامەیەك بۆ مرۆڤ باشە و بەختەوەری مرۆڤی تێدایە بۆی هەڵبژاردووین، ئینجا هەر خۆی ڕازی بووە کە ئیسلام بەرنامەی دروستکراوەکانی بێت.
﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا﴾[2]. واتە: ئەمڕۆ ئاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواو کردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان.

[1] - سورەتی الملك ئایەتی (١٤).
[2] - سورەتی المائدة ئایەتی (٣).

جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە لەلایەن مرۆڤەوە، مرۆڤ خۆشبەخت و سەرفراز دەکات لە دونیا، چونکە بۆ خوا ژیان لە دونیا دەبێتە هۆی بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە، پاشان لە قیامەت بەهەشت شوێن و مەکانی دەبێت.
هەروەك فەرموویەتی: ﴿تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[1]. واتە: ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە پێتان دراوە بەهۆی ئەو کارو کردەوانەیە کە لە دونیا ئەنجامتان دەدا.
بەڵێ خوێنەری بەڕێز: بزانە هۆکاری بەدەستهێنانی بەهەشت خۆماندووکردنە بەو کردەوانەی فەرمانپێکراوی خوای گەورە پاشان پێغەمبەری ئازیزن (ﷺ) چونکە بەهەشت بە ئاسانی بەدەست نایەت و شەونخونی و کارو کردەوەی چاکی دەوێت، ئەو کردەوانەش دەبێ بەپێی یاساو بەرنامەی ئیسلام بێت.
ئینجا ئەگەر بێت و سەیری سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام بکەین، کە مرۆڤایەتی چۆن نەفام و نەزان بوون و گومڕابوو بوون لە جاهیلیەتی خۆیان کەوتبوونە نێو شیرك و کوفر و گومڕاییەکی ئاشکرا، هەرچی خراپە و تاوان هەیە ئەیانکردو ئەنجامیان ئەدا، خوێنیان بە ناحەق ئەڕشت، ئازاری دراوسێیان ئەدا، کەس لەکەس ئەمین نەبوو متمانەیان بەیەك نەبوو، هەرکەس منداڵی کچی بوایە پێی شەرم بوو بەمناڵی زیندە بەچاڵیان ئەکرد، دەستدرێژیان ئەکردە سەر ناموسی یەکتر، عەدالەت و یەکسانی نەبوو لەنێو دەوڵەمەند و هەژار، دەوڵەمەندەکان هەژاریان ئەچەوساندەوە زوڵمیان لێ ئەکرد، بت و پەیکەر و دار و بەرد و ئەستێرەو ڕۆژیان ئەپەرست پەنا بە خوای گەورە.
ئەمانەو سەدان خراپەو تاوانی تر، کە ڕۆژگاری تاریك کردبوون و ژیانی مرۆڤەکانی سەخت و دژوار کردبوو، وەك مرۆڤ نەیان دەتوانی بژین بەڵکو بەپێچەوانەوە وەك ئاژەڵ ئەژیان و تەنها خواردن و خەو و ڕابواردن بوو، ئەوجا خوای پەروەردگار پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، لە شەوە زەنگ و زۆنگاوی جاهیلی و نەزانی ڕزگاری کردین، ڕێنمونی کردین بۆ ڕێگای سەرفرازی و بەختەوەری و ڕێبازی ئیسلام،

[1] - سورەتی الاعراف ئایەتی (٤٣).





﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾[١]. واتە: هەر ئەو خوایە پێغەمبەرەکەی خۆی (ﷺ) ناردووە هاورێ لەگەڵ هیدایەت و رێنمووبی و ئاینی حەق و راستیدا کە ئیسلامە، تا سەری بخات بەسەر هەموو رێسا و ئاین و بەرنامە دەستکردەکاندا.

بەڵێ خوێنەری بەرێز: بۆیە خوای کارزان تاکە بەرنامەو دین و ئاینێك هەبێ لەدونیادا کە پێی رازیبێت تەنها ئیسلامەو، غەیری دینی ئیسلام هەر دینێکی تر مرۆڤ پەیڕەوی بکات لێی قبووڵ ناکرێت و، تەنها ماندبوونی بۆ هەیە بەبێ پاداشت.

وە ئەگەر هەموو دونیا پشت لە دین و یاسای خوای گەورە بکات، بچنە سەر ئاین و بەرنامەیەکی تر، خوای گەورە کاروکردەوەیان قبوڵ ناکات، هیچ پاداشت و چاکەیان بۆ نیە لە قیامەت دا، چونکە بەرنامەی تریان هەڵبژاردووە و پەیڕەوی دەکەن بەسەر بەرنامەی دروستکەری گشت بوونەوەر کە خوای گەورەیە.

﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾[٢]. واتە: جا ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر یاساو ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە.

بۆیە هەرکەسێك لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام، هەر کارێك بکات هەر چاکەیەك بکات، هەر خزمەتێک بە خەڵکی بکات لێی قبول ناکرێت و دەبێت ئیلا موسوڵمان بێت و ئیسلام بەرنامەی بێت و پێغەمبەریش (ﷺ) پێشەوای بێت.

بۆ نمونە: ئەبو تاڵیبی مامی پێغەمبەر (ﷺ) کە زۆر بەرگری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد دژی خزم و دووژمنانی، تا لە ژیان بوو نەی هێشت کەس ئازاری پێغەمبەر (ﷺ) بدات بەڵام ئەو چاکانە سودی بۆی نەبوو، تا لە ئاگری دۆزەخ رزگاری بکات.

---

[١] - سورەتی الصف ئایەتی (٩).

[٢] - سورەتی ال عمران ئایەتی (٨٥).





هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: عن ابن عباس (ﷺ) أن النبي (ﷺ) قال: (أَهْوَنُ أهلِ النَّار عَذاباً أبُو طالِب وهوَ مُنْتَعِلٌ بنَعْلَيْنِ مِنْ نارٍ يَغْلِي مِنْهُما دِماغُهُ)[1]. واتە: لە (ئیبن و عەباسە)وە ( رەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرموویەتی: سوکترین سزای ئەهلی دۆزەخ بۆ ئەبو تاڵیبە کە دوو سەرپێی لە پێیە(نەعلی لە پێیە) مێشکی دەکوڵێ.

کەوابو بزانن رەحمەتی خواتان لێبێت، چاکە و خزمەتی خەڵك بۆ کەسێك ئیسلام بەرنامەی نەبێت سوودی نیە بۆ پاشەڕۆژی کە قیامەتە، ئەوە ئەبو تاڵیبە کەمامی پێغەمبەرە (ﷺ)کە زۆر پشتیوانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کەچی ئەهلی ئاگرە.

بۆیە تاکە دین و بەرنامەی قبوڵکراو لای خوای گەورە هەر ئیسلامە.

﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ﴾[2]. واتە: بەڕاستی دین و ئاینی پەسەندکراو لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە.

بۆیە دەبێ ئێمەی موسوڵمان پابەندی بەرنامەکەمان بین، لەو رێساو یاسایانەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووین، تاوەکو لە دونیا و قیامەت سەرفرازبین، کە بەرنامەی ئیسلام هیچ بەرامبەرێکی نیە لەسەر زەوی کە تەواوترین و باشترین بەرنامە و یاسایە بۆ مرۆڤەکان، کەتێیدا بەختەوەری و سەرفرازی بەدەست دێت.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[3]. واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات بۆ سەر ماڵ و نەفس و ناموس و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و تێفکرن.

---

[1]- مسلم گێڕاویەتەوە، ژمارەی فەرموودە: (٢١٢).

[2] - سورەتی ال عمران ئایەتی (١٩).

[3]- سورەتی النحل ئایەتی (٩٠).





لەم ڕۆژگارەی پڕی ناخۆشی و فیتنەو ئاژاوەی کە دونیای گرتۆتەوە، هیچ بەرنامەو یاسایەك چارەو چارەسەریەکی ئەوتۆی پێ نییە بە غەیری دینی ئیسلام، ڕۆژ بە ڕۆژ باس وخواس دەبیستین لە فلانە دەوڵەت و فلانە شار، قەیرانی ئابوریە، کێشەی ئاو و کارەبایە، کێشەی ڕێگا و بانە، کێشەی نەبوونی خۆراکە، سەدان کێشەیان هەیە لە کۆتایش دا لە خۆپێشاندانەکەدا دەیان و سەدان کەس کوژران!.

چونکە بەرپرسانی وڵات لەغەیری دینی ئیسلام، بەرنامەی تر پەیڕەو دەکەن، کە خۆیان بە ئارەزوویی نەفسی خۆیان دایان هێناوە و نووسیویانەتەوە بۆ مرۆڤایەتی کەپێی دەڵێن: دیموکراسی، لەژێر سایەی ئەم بەرنامەیەدا پڕیەتی لە زوڵم و ستەم و ناپاکی، پڕیەتی لە نادادگەری و بێ ڕەوشتی، کە شوێن کەوتنی ئەم بەرنامەیە و ڕازی بوون پێی کوفر و شیرکە پەنا بە خوای گەورە. بۆیە چارەسەری و خۆشگوزەرانیان پێ نییە بۆ مرۆڤایەتی، جگە لەشەڕ و ئاژاوە و ناخۆشی و برسییەتی و نەبوونی، بەڵام بەرنامەو یاسای ئیسلام جوانتری و دادگەرترین یاسایە، لە ناو گشت بەرنامەکان تاکە ڕێسایيە بۆ هێنانەدی خۆشگوزەرانی کەچی مرۆڤایەتی پشت گوێیان خستوە!

بۆیە گەر هەموو خەڵکی دونیا کۆببنەوە تاکو بەرنامەیەك دابنێن بۆ مرۆڤایەتی کەژیانیان بەختەوەر و خۆش بکات، ئەوە نەجاحەت و سەرکەووتن بەدەست ناهێنن، چونکە چۆن دەکرێ بەرنامەیەك داهێنرێ کە ئارەزووی دەستی مرۆڤەکان بێت دژی بەرنامەی خوای دروستکەری مرۆڤ.

هەروەك ئەو کەسەی کە کۆمپیۆتەری دروستکردووە خۆی شارەزاترە بەچۆنیەتی بەکارهێنانی، ئایە دەکرێت کەسێکی نەزانی نەخوێندەوار خۆی بکاتە خاوەنی کۆمپیۆتەر و، هەر لەخۆیەوە بەبێ شارەزای بڵێت: ئەوها بەکاری بێنن، ڕێنمای بدات بۆ بەکارهێنەرەکانی، بۆیە هەرکەس بەگوێی بکات زەرەر دەکات و کار و ژیانی دەفەوتێ و لەناو دەچێت.

بۆیە هەرکەس یاسای غەیری یاسای ئیسلام بۆ مرۆڤەکان دەربکات ئەوە خۆی و شوێنەکەوتووەکانی گومڕا دەکات، و دەیانخاتە ناو ژیانێکی پڕ لەناخۆشی و نەهامەتی.





﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[1]. واتە: ئاخر بۆ بیرناکەنەوە کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و دادپەروەرو چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.
مێژوو شاهیدە بەدرێژای ڕۆژگار کە ئەو کاتەی ئیسلام حوکمی دەکرد، چۆن ژیانی مرۆڤایەتی لە ئەوپەری بەختەوەری و خۆشگوزەرانی بوو.
نمونەش: داپەروەری پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب) (ڕەزای خوای لێبێت) کە لەسەردەمی ئەودا منداڵی شیرە خۆر پارە و موچەی خۆی هەبوو.
خۆشترین ژیانیان بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەر کردبوو کە خۆی لەناو بەرنامەی ئیسلام دەبینێتەوە. یاخود نمونەی: خەلیفەی لەخواترسی پێنجەم، پێشەوا (عومەری کوری عبدالعزیز) (ڕەزای خوای لێبێت) کە لەسەردەمی حوکومڕانی ئەودا پارەو پولی زەکات ئەوەندە زۆر بوو، خەڵکەکەش لە ئەو پەڕی خۆشگوزەرانی و خۆشی دابوون.
ئەمەش هەموو لە فەڕو بەرەکەتی یاساو بەرنامەی خوای کارزانە کە ئیسلامی پیرۆزە، بانگدەرێک لەشەقامەکاندا بانگ دەکات: کێ دەیەوێ ژن بێنێ بۆی دێنین، کێ دەیەوێ ماڵێکی بۆ دروست بکەین بۆی دروست دەکەین. کێ قەرزارە قەرزەکەی بۆ دەدەینەوە.
ئەم ووشانە لە سەردەمی ئێستاماندا نەوتراوە، وە لەسەردەمی هەڵسانەوەی ئەورووپاش نەوتراوە، وە لە دەوڵەتە پڕ لە نەوت و کانزاکانیش نەوتراوە.
بەڵام خەلیفەی دادپەروەر (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لە ماوەی دوو ساڵ و پێنج مانگی حوکمیدا، زەکاتیان دەگێڕا بەسەر خەڵکیدا کەس وەری نەدەگرت!!
تا فەرمانی کرد لەسەر لووتکەو چیاکان گەنم بڕێژن و بڵاوی بکەنەوە، پاشان ووتە بەناوبانگەی فەرموو: بۆ ئەوەی خەڵکی پێم نەڵێ باڵندەکان لە وڵاتی موسوڵمانان برسی بوون !![2]

[1] - سورەتی المائدة ئایەتی (٥٠).
[2] - (سيرة عمر عبدالعزيز لابن الحكم ص١٦٤).





بەڵام بەداخەوە ئەمرۆكە نەك باڵندەكان، بەڵكو سەرجەم مرۆڤایەتیان برسی و بەدخۆراك كردووە! بەڕاستی ئەوانە نمونەی: قوتابی سەر ڕاست و گۆشكراوی بەرنامەی ئیسلام و، شوێن پێ هەڵگری ڕاستەقینەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون.

ئەمەیە بەروبومی بەرنامەو یاسای خوای گەورە، ئەمە چەندین سەدەیە مێژوو پیاوی وەك كەلە پیاوانی ئیسلامی بەخۆوە نەدیوە، لە ئازایەتی و جوامێری، خواویستی، دونیا نەویستی وخاكی بوون، دادپەروەری، هەرچی سیفاتی چاك و باش هەیە لەواندا كۆبوو بوویەوە، چونكە بەڕاستی ئەمانە دەرچووی قوتابخانەی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێن ڕێبازی ئیسلام كەوتبوون، نەك هەواو هەوەسی نەفسی خۆیان كوێرانە نەكەوتنە دوای داوی شەیتان.

بۆیە جیهان جارێكی تر خۆشی و خۆشگوزەرانی بەخۆیەوە نابینێت، تا بە زەلیلی نەگەڕێنەوە بۆ ژێر یاساو بەرنامەی دروستكەری گشت بوونەوەر كە ئیسلامە، بۆیە تا فرسەتەو لە ژیان داین و نەمردووین باخۆمان تەسلیمی یاساو فەرمانی خوای مەزن بكەین.

﴿وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ﴾[1] واتە: بگەڕێنەوە بۆلای خوا بەملكەچی، خۆتان تەسلمی بكەن.

چونكە هەر ئیسلامە مایەی خۆشگوزەرانی بۆ مرۆڤایەتی لە دونیا و قیامەت، بۆیە دەڵێین بەڵێ ئیسلام سارێژكەری گشت دەرد و برینە بێ دەرمانەكانە.

كەوابو ئەی موسوڵمانان با لە ئێستاوە بەڵێن بەخوای گەورە بدەین سەر ڕاستانە بۆ ئیسلام بژین و بمرین، تا لە قیامەت پاداشتمان بەهەشتی پڕ لەنازو نیعمەت بێت، بە ئیزنی الله تعالى.

[1]- سورەتی الزمر نایەتی (٥٤).





# وەفاو سۆزێك بۆ پێشەواکەم

بەڕاستی کەبیرم کردەوە بچمە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك وەفایەك کەمێك باسی ژیانی بکەم، بەڵام لەئاستی دا وەك منداڵێکی تازە لەدایك بوو وابوم و زمانم گۆی نەدەکردو نەم دەزانی لەچ ڕوویەکەوە لەسەریان بدوێم، چونکە هێندە مەزنە بەهیچ شێوەیەك وەسفی ناکرێت، لەمەردایەتی و جوامێری، لەخوا ویستی و دونیا نەویستی، لە بەخشین و دەستکراوەیی، لە خواپەرستی و چاکەکاری، لە تەوازوعی و خاکی و خۆبەکەمگری، لە خشوع و لەخواترسانی، لە نەرمونیانی و ئارامگری، لە سۆزو رەحم و میهرەبانی، لە جیهاد و تێکۆشانی، لە سەرکردایەتی و پێشەوایەتی، نەمزانی چۆن وەسف و سەنای ئەو سەرکردە و پێشەوا دلێرە بکەم، بەڕاستی ئەقڵ و بیرو هۆشم منیان وەستاند لەبەرامبەر وەسف و پیاهەڵدانی ئەو گەورە و پێشەوایە، رایانچڵەکاندم بەوەی کەهەرگیز قەلەمی بەندەیەکی موحتاجی خودای گەورە ناتوانێت بگاتە ئاستی وەسفکردنی ئەم پێشەوا مەزن و جوامێرە، بەڵام دڵی شەکەت و ماندووی لە تاو ئازارو ناخۆشی ڕۆژگار بەفرمێسك و گریانەوە بەهەناسەیەکی قوڵ و لەناخێکی پڕ ئازارەوە هاتە وەڵام قبوڵی نەکرد بەوەی نەنوسم لەسەر ڕابەر و نوری چاومان، گوتی: هەستەو قەلەم بگرە دەست و دەست بکە بەنووسین و بنووسە لەسەر خەمخۆری ئوممەتی ئیسلام، پێشەنگ و پێشەوای پێغەمبەران "محمد مصطفى" (ﷺ) بنووسە گەر چەند دێریکیش بێت یان تەنانەت چەند ووشەیەکیش بێت، بیکە بەنامەو بەسەراپای جیهاندا بڵاوی کەوە ڕایبگەینە، بینێرە بۆ پادشاو سەرۆك و کاربەدەستان پێیان ڕابگەینە ئێوە شەرمەزار و سەر شۆڕن بەرامبەر ڕابەرەکەم، ئێوە ناگەن بەتۆزی ژێر پێیە پیرۆزەکانی، پێیان بڵێ ئێوە تەنها بۆ خۆشی خۆتان ئەژین، دونیاتان کرد بەدۆزەخ بۆ مرۆڤەکان لە پێناو خۆشی خۆتان، بەڵام پێشەواکەم بۆگشت ئوممەت ژیا تاکو ڕزگاریان بکات لە شەوە زەنگی تاریکی و نەفامی،





بۆ ڕووناکی ڕەحمەت و سۆزو میهرەبانی ئیسلام، لەناخۆشی و نەهامەتی و برسیەتی بۆ بەختەوەری خۆشگوزەرانی و دادپەروەری.

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾[1]. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان.

بەڵێ ڕابەرەکەم لەماوەی بیست و سێ ساڵی پێغەمبەرایەتی تەواوی جیهانی گۆڕی لە نەهامەتی و ناخۆشی و یەکتر کوشتن و غەدرو زوڵم و ستەم و خراپە بۆخۆشی ژیان و هەستکردن بە مانای مرۆڤ بوون، لەبەندایەتی کردن بۆ بەندە بۆ بەندایەتی خوای گەورە، بەڵێ خوای گەورە ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) بۆ کردین بەنورو ڕووناکی تا خەڵکی ئاگادار بکاتەوە بە وازهێنان لەو کردەوانەی سنووری خوا دەبەزێنن و ئاشنایان بکات بە تەشریع و بەرنامەی ئیسلام و فەرمانەکانی خوای گەورە.

﴿وَدَاعِيًا إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجًا مُنِيرًا﴾[2].واتە: هەروەها بانگەواز دەکەی بۆلای خوا لەسەر مۆڵەتی ئەو، چرایەکی ڕووناکیشی بۆ سەرجەم سەرگەردانان.

لە مێژووی مرۆڤایەتی هیچ مرۆڤێك نە لەپێش خۆیەوە نە لەدوای خۆی وەك ئەو نەبوە و نابێ، لەهەموو ڕوویەکەوە سەر مەشقە هەر لەپێش ئەوەی خوای گەورە بیکات بەپێغەمبەر(ﷺ) بەڕاستگۆی دەستپاك ناسرابوو، لەنێو خەڵکی واتە دەستپاك ترین و ڕاستگۆترین کەس بوو، لەڕووی ڕەوشت و ئەخلاقەوە باشترین مرۆڤ بووە هەتا لەگەڵ منداڵ و پیرو گەورەکاندا، کاتێ بەلای منداڵاندا تێپەڕ دەبوو سڵاوی لێدەکردن.

جوانترین ڕەوشتی بەرامبەر بەخێزانەکانی پەیڕەو دەکرد، بۆ دەربڕینی خۆشەویستی ناوی (عائیشە)ی (ڕەزای خوای لێبێت) کورت دەکردەوە دەیفەرموو: (یاعائش) بەشێوەیەک ڕێزی دەگرتن کە بەناوی باوکییەوە بانگی دەکرد و دەیفەرموو: کچی صدیق، هەتا لەگەڵ شێت و کەم عەقڵەکان بەجوانترین شێوە مامەڵەی کردووە.

---

[1] - سورەتی الأنبیاء ئایەتی (١٠٧).

[2] - سورەتی الأحزاب ئایەتی (٤٦).





ئەنەسی کوری مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ئافرەتێك کەمێك عەقڵی ناتەواو بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێویسیەکم پێتە، پێی فەرموو: ئەی دایکی فڵانەکەس بزانە بۆ کوێت دەوێت تا پێویستیەکەت بۆ جێبەجێ بکەم، ئەویش بەو ڕێگایانەدا بردی تا پێویستییەکەی تەواو کرد.[1]

بەڕاستی مرۆڤ ناتوانێ بە ووتە باسی سیفەت و ئەخلاق بەرزی ئەم سەرکردەیە بکات، ئەم ئافرەتە عەقڵی تەواو نەبوە ئاوا لەخزمەتی بووە کارەکەی بۆ ڕاپەڕاندووە بەبێ هیچ کرێ و بەرژەوەندیەك، ئەم پەیامە کەئیسلامە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە مایەی ڕەحمەت و بەختەوەریە بۆ گشت مرۆڤایەتی بەبێ جیاوازی عاقڵ و بێ عەقڵ ڕەش و سپی، عەرەب و عەجەم، گشت کەسێك دەبێ مافی خۆی پێ بدرێت لە هەرشوێن و جێگایەك بێت، بۆیە هەرچی باس بکەین لەئاست ئەخلاق و گەورەی ئەم پێشەوایە هەرکەمە، ئەمەش شاهێدی خوای گەورەیە بۆی هەروەك وەسفی دەکات.

﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾[2]. واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و ئەخلاقێکی ئێجگار بەرزو گەورەیت.

بەڵێ ئەم رابەرە لەپێ هەڵدانی کۆتای نایەت مرۆڤێکە لەوەسف و سەناو گەورەیدا کانیاوێکی سازگارە هەڵدەقوڵێ لەبەری دەڕوات هەتا دونیا ماوە کۆتای پێ نایە.

بەڵێ بەڵام بەداخەوە زۆرینەی خەڵکی لەم سەردەمەدا بێ وەفان بەرامبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسەرتاپای تەمەنی بۆخزمەتی دینی خوا پاشان بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لەنەهامەتی بۆ خۆشی و کامەرانی کردە قوربانی تاکو بەتاك و تەنها خوای گەورە بپەرسترێ لەسەر زەوی، تاکو تەشریع و دەستوری خودای بەدەسەڵات حاکم بێت لەسەر زەوی خۆشیەکانی ژیانی خۆی کردە فیدای مرۆڤەکان، میحنەت و تاڵی زۆری چێشت بۆهێنانەدی ڕووناکی بەرنامەی ئیسلام.

---

[1] - مسلم گێراویەتەوە، ژمارەی فەرموودە: (٤٤١٤).

[2] - سورەتی القلم ئایەتی (٤).





دونیا نەویستانە ژیا بۆخوای گەورە قیامەت و بەهەشتی هەڵبژارد بەسەر خۆشی کەمی دونیای کاتی، ئا ئەوەیە سەرکردە ئەوها ژیاوە هەتا لەدونیابوو لەسەر دۆشەك و مافورێکی نەرم نەخەوت، بە پێچەوانەی ئەم سەرکردانەی ئێستا بەدرۆ ناویان لەخۆ ناوە سەرکردە بەزەبری هێز هاتوونەتە سەرحوکم و مافی خەڵکی هەژار دەخۆن لەسەر حیسابی فەقیر و هەژاری خۆشی نەدیو ئەژین، دونیایان داگیر کردووە بەرزترین خانوو و کۆشکیان هەیە، خۆشترین خواردن ئەخۆن، بەرزترین مۆدێلی سەیارەیان هەیە، وا دەزانن دونیا بەس هی ئەوانە هەروا بۆ ڕابواردن دروستکراون، ئینجا بابچینە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بزانین حاڵی ئەو سەرکردە چۆن بووە لەکاتێکدا ئەویش دەی توانی باشتر لەمانە بژیت، با بەیەکەوە سەیرێکی ماڵی ئەم پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) بکەین لەسەر چی نوستووە.

(دَخَلَ على رَسُول اللهِ(ﷺ)عُمَرَ بن الخَطاب(رضي الله عنه) ذاتَ يَوم فَوَجَدَهُ قَدْنامَ على حَصير وَأثَّرَ الحَصيرَ في جَسَدِه،فبَكى عُمَر فَقالَ: لَهُ مُحَمَّد(ﷺ)مَايُبْكِكَ؟ قال عُمَر: يارَسُول الله(ﷺ) فَإنَّ كِسْرى وَقَيصَر فِيماهُمْ فِيهِ وَأَنْتَ رَسُول الله(ﷺ) فَقالَ: أَمَّا تَرضى أَنْ تَكُون لَهُمُ الدُّنْيا وَلَن االآخِرة؟)[1]. واتە: جارێک (عومەری کوڕی خەتتاب) (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لە سەر بێت) ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیتی لە سەر (حەسیرێک) پاڵی داوەتەوە، شوێنەواری (حەسیرەکە) لە لاشەی پێغەمبەر (ﷺ) دەرکەوتووە، (عومەر) (ڕەزای خوای لێبێت) گریا، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: بۆ ئەگریت؟ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)کیسرا و قەیسەر لە چی دان و تۆش لە چی دایت ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جا ئەی (عومەر) تۆ حەز ناکەیت ئەوان دونیایان هەبێت و ئێمەش قیامەت و دواڕۆژ؟.

[1] -(صحيح البخاري. ژمارەی فەرمووده:(٤٩١٣).





بەڵێ ئەم ڕابەرە دواڕۆژی هەڵبژارد، ئازار و ناخۆشی دونیای خستە کۆڵ و بەنەبوونی ژیا، ڕۆژێك ژەمە خواردنی خۆشی نەخوارد، ئەمە دایکە (عائیشە) (ڕەزای خوای لێبێت) باسی سەختی و نەبوونی ژیانی ئەم پێشەنگە ئەکات.

(عَنْ عَائِشَةَ (﵁) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: لَقَدْ مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَمَا شَبِعَ مِنْ خُبْزٍ وَزَيْتٍ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ)[1]. واتە: (عائشە)ی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا وەفاتی کرد لە ڕۆژێکدا دوو جار تێرنان و ڕۆنی نەخواردووە.

بەڵێ ئەو سەرکردە بوو هاوەلان هەموو گیانیان لەسەر دەست بوو بۆی ئەی توانی خۆشترین ژیان بەڕێ بکات، بەیەك قسە خۆشترین خواردنیان دەهێنا خزمەتی و بەرزترین خانوویان بۆ لە زێر دروست ئەکرد، بەڵام خۆی داوا لەخودای گەورە دەکات رزق رۆزی خاوخێزانی هەر ئەوەندە بێت پێ بژین.

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (﵁) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) :(اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا)[2]. واتە: (ئەبو هورەیرە)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی: خوایە ڕزق و ڕۆزی بنەماڵە و نەوەی (محمد) هەر ئەمەندە بێت پێی بژین.

قوربانی پێغەمبەرەکەم بم بزانە ئەی براو خوشکی من ڕەحمەتی خوات لێبێت، چۆن داوا لەخوای گەورە دەکات تەنها ئەوەندە ڕزق و ڕۆزیان پێبدات کە تەنها بژین، نەك داوای هەموو دونیا بکات بۆخۆی و کەس و کاری چونکە دەیزانی کاری ئەو تەنها خۆشی و رابواردن و پاڵدانەوە نیە بەڵکو بۆ ماوەیەکی کاتی لەدونیا ئەمێنێتەوە تاکو پەیامی خوا بەسەر زەوی بڵاوکاتەوە ئەرکی خۆی کە بانگەوازی تەوحید و یەکخواپەرستیە دواتر ئەبێ بمرێت و بگەڕێتەوە بۆ لای خودای گەورە.

---

[1] - (صحیح مسلم، ژمارەی فەرمووده: ٢٩٧٤).

[2] - (صحیح البخاري، ژمارەی فەرمووده: ٦٤٦٠، ومسلم ژمارەی فەرمووده: ١٠٥٥).

﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ﴾[1]. واتە: ئەی محمەد ﴿ﷺ﴾ بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن.

بەڵێ بۆیە دڵی بەدونیا و خۆشیەکانی نەدا، گەرنا ویستبای داوای لە خوای گەورە دەکرد شاخ و چیاکانی بۆ ئەکرد بە زێڕ و گەوهەر، بەڵام نەی ویست بۆیە دەفەرمووێت:

(لو كان لي مثل أُحد ذهباً لَسُرُني أن لا تمر عليّ ثلاث ليالي وعندي منه شئ إلا شيئاً أرصده لِدَيْن)[2]. واتە: گەر بە قەد کێوی ئوحود زێڕم هەبووایە، ئاسوودە ئەبووم کە سێ شەو بەسەرمدا ئاوا نەبێت، کە هیچ شتێکم لەو زێرە لا مابێت، تەنها ئەوەندە نەبێت کە بۆ قەرز بیهێڵمەوە.

سبحان الله لەگەورەی ئەو پێشەوایە بەڕاستی شەرمە بۆ موسوڵمان ڕێگەو ڕێبازی ئەو ئازیزەی کردۆتە قوربانی خولیای ویست و ئارەزووەکانی بەدووای ڕێچکەی گومڕای و داوی شەیتان کەوتووە.

ئەو جا ئەو رابەر و پێشەوایە لەدوای وەفاتی کۆچی بەئازاری هیچ میرات و شتێکی وا لەدوای خۆی بەجێ نەهێشت کەشایەنی باسکردن بێت، وەکو بەناو سەرکردە دونیا پەرستەکانی ئەم سەردەمە کە بەهۆی زۆری پارەو موڵکیان لەبانکی وڵاتان هەڵئەگرن، بۆخۆشی نەفسی ناپووختیان شوقە و مۆڵ و کۆمپانیا لە وڵاتان دەکڕن، نازانن چی لەپارەو سەروەتیان بکەن منداڵەکانیان هەر ڕۆژەو مۆدێلی سەیارەو جل و بەرگ و پێڵاویان ئەگۆڕن، گەرماو سەرمای هاوین و زستانیان لە وڵاتێك بەسەر ئەبەن بۆخۆشی ڕابواردنی خۆیان.

ئەمەش میراتی گەورەی مرۆڤایەتی کە پێغەمبەری خوایە ﴿ﷺ﴾ بزانین چی لەپاش بەجێماوە.

---

[1]- سورەتی الزمرنایەتی (٣٠).

[2] - (رواه البخاري عن ابي هريرة، ژمارەی فەرموودە: ٢٣٨٩).





(عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ،(ﷺ) قَالَ مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَمًا وَلاَ دِينَارًا وَلاَ عَبْدًا وَلاَ أَمَةً وَلاَ شَيْئًا، إِلاَّ بَغْلَتَهُ الْبَيْضَاءَ وَسِلاَحَهُ وَأَرْضًا جَعَلَهَا صَدَقَةً )[1].واتە: لە (عمرو کوڕی حارث) (خوای گەورە لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە دەفەرموێ: کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی فەرموو: تەنها درهەمێ یان دینارێ یان بەندەیەك یا کۆیلەیەك یا هیچ شتێکی لە پاشە خۆی بەجێ نەهێشت، تەنها هێسترە سپیەکەی و شمشێرەکەی و زەویەك نەبێت کە بۆ خێر هەڵی گرتبوو.

ئازار و ناخۆشی و میحنەتی ئەم پێشەوایە بەنوسینێکی کورت تەواو نابێ، چونکە بەڕاستی ئەو لەژیانی دونیا تێگەیشتبوو کە ماوەیەکی زۆر کەمە، بۆیە بەرگەی گشت ئازار و ناخۆشیەکی ئەگرت، لە (عبدالله کوڕی مسعود)وە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) لە سەر حەسیرێك پاڵ کەوتبوو، ئاسەواری حەسیرەکە لە سەر پێستی دیار بوو! ئەڵێ: منیش چووم ئاسەوارەکەم لەسەر پێستی پێغەمبەر (ﷺ) سڕیەوەو گوتم: دایك و باوکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگەمان پێ نادەیت کە شتێکی ترت بۆ ڕابخەین تا لە سەری بخەویت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (مَا أَنَا وَالدُّنْيا! إِنَّمَا وَأَنَا وَالدُّنْيا كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ. ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا)[2]. واتە: من چیم داوە لە دونیا، من لە گەڵ دونیا تەنها وەك ئەو سوارە وام، کە ماندوو ئەبێ و پاشان لە ژێر سێبەری دارێك دا ئەنیشێو پاشان ئەڕواو جێی دەهێڵێت.

بۆیە تەنها بۆئەوە ژیا تاکو بە تەشریع و دەستوری خوا سەر زەوی رووناك بکاتەوە تاکە بەرنامەو یاسا تەنها قورئان بێت، کە باشترین یاساو پرۆگرامە بۆ خۆشگوزەرانی تەواوی مرۆڤایەتی.

[1] - (صحيح البخاري ، ژمارەی فەرمووده: ٤٤٦١).

[2] - (أخرجه الترمذي، (٤/ ٥٧٨)، ژمارەی فەرمووده: (٢٣٥٣)، وأحمد (١٦/ ٣٨٣)، ژمارەی فەرمووده: (١٠٦٥٤).





﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[1]. واتە: ئاخر بۆ بیرناکەنەوە کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و دادپەروەرو چاکو بەجێ بێت، بەتایبەت لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.
بەڵێ ئەم پێشەنگ و سەرمەشقی مرۆڤایەتیە تەنها بۆ ئەوە ژیا تاوەکو گشت یاساو دین و بەرنامە و بڕیارێك تەنها بۆ خوای ئەرز و ئاسمان بێت.
﴿وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ﴾[2]. واتە: تا دین و بەرنامەو بڕیار هەر هەمووی بۆ خوا بێت.
بەڵام زۆر بەداخەوە بۆ موسوڵمانان کە هیچ گرنگی بەو پێشەوایە نادەن و ڕێگاو سوننەت و ئاکاری ئەویان پشت گوێ خستوە، تەنها ئامانجیان خۆشی و لەزەتی کەمی دونیایە بۆیە حاڵی موسوڵمان و تەواوی ئوممەتی ئیسلام پەشێوە و دووبەرەکی کەوتۆتە نێوانیان لەبەر تەماحی ماڵی دونیا پشتیان لە ڕێگاکەی کردووە، ئەگەر سەیری هاوەڵانی بکەین بەڕاستی هەموو سەروەت و سامان و ماڵیان تەنانەت گیان و ڕوحیان خستبووە ناو لەپی دەستیان و پێشکەش بە پێشەواکەیان کردبوو.
کاتێك (عەلی کوڕی ئەبوطالیب) (فاطیمەی) کچی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە هاوسەر گرت، (خوای گەورە لە هەردووکیان ڕازی بێت) بۆ ماڵێك دەگەڕا تا تیایدا نیشتەجێ بێت، بەڵام خانوویەکی دوور لە ماڵی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەست کەوت و لەوێ گواستیەوە، پێغەمبەر (ﷺ)هات بۆ ماڵیان و پێی فەرموون: دەیەوێت نزیکیان بکاتەوە لە ماڵی خۆی.
(فاطیمەش) گوتی: داوا لە (حارثە) (ڕەزای خوای لێبێت) بکە تا شوێنەکەی بگۆڕێتەوە لەگەڵمان تا نزیك بینەوە، پێغەمبەریش (ﷺ)فەرمووی: (حارثە) هێندە شوێنی خۆی بۆ چۆڵکردوین ئیتر ڕووم نایەت پێی بڵێم).

---

[1] - سورەتی المائدة ئایەتی (٥٠).
[2] - سورەتی الانفال ئایەتی (٣٩).




(حارثه) (ڕەزای خوای لێبێت) ئەوەی بیستەوەو و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستوومە دەتەوێت (فاطیمە) لێتەوە نزیك بێت و ئەوەش خانووەکانی منن، من خۆمو ئەوەشی هەمە بۆ خوا پاشان پێغەمبەری خوایە (ﷺ) سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی تۆ لێم وەردەگریت لام زۆر خۆشترە لەوەی وازی لێ دێنیت بۆم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ڕاست دەکەیت، خودا بەرەکەت برژێنێت بەسەرتدا)، ئەوەبوو (فاطیمە) هاتە ناو خانویەکی (حارثە) کە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، (حارثە) لە نزیك مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ)چەند خانویەکی هەبوو، هەر جارەو یەکێك لەو خانوانەی چۆڵ دەکرد بۆ خۆشەویستێکی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) تاکو هەموو خانوەکانی ئەو شوێنەی دا بە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوسەرەکانی)[1].

ئەمانەن نمونەی پیاوی جوامێرو گیان فیدای ڕێبازی ئیسلام، ئەم هەڵوێستانەیان شاهێدی ئەوە ئەدات ئەمانە ئەهلی بەهەشتن، کە گشت کارو کردەوەیان بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بوو بەسەرو ماڵ لەخزمەت خۆشەویستی خودا بوونە.

ئەمەش کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دان بەو ڕاستیە دەنێن کە هیچ کەس لەمێژوو وەك هاوەڵانی پێغەمبەر خودا (ﷺ) نەبوونە بۆ خۆشەویستەکانیان بەئەندازەی هاوەڵان.

لە(سوڵحی حودەیبیە )دا نێردراوی کافرەکان (عروەی کوڕی مسعود) ویستی دەست بدات لە ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە کاتێکدا قسەی لەگەڵدا دەکرد، هاوەڵی خۆشەویست (مغیرەی کوڕی شعبە) (ڕەزای خوای لێبێت) نوکی شمشێرەکەی دا لەدەستی (عروەی کوڕی مسعود) و پێی فەرموو: دەستت دوور بخەرەوەو لە ڕیشی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەستت نزیك مەخەرەوە ئەگینا دەستت و مەچەکت دەبڕمو نایەڵم جارێکی تر بەسەلامەتی دەستت بگێڕیتەوە.

[1] - (الطبقات الکبری لابن سعد ، ج ٨ , ص ١٦٦).





کاتێك (عروەی کوڕی مسعودی) بێ باوەڕ گەڕایەوە بۆ لای بێ باوەڕەکانی شاری مەککە پێیانی گوت: (سوێند بە خودا نازانم ئەمانە چ کۆمەڵێکن چەندەها جار بە وەفدی چوومە بۆ لای پاشاکان و بە وەفدی چوومە بۆ لای قەیسەری پاشای ڕۆم و کیسرای پاشای فارسو نەجاشی پاشای حەبەشە سوێند بە خودا هیچ پاشایەکم نەبینیووە کە هاوەڵ و هاوڕێکانی بە گەورەی بزانن و ڕێزی بۆ دابنێن بە ئەندازەی ئەو ڕێزو گەورەییەی کە هاوەڵانی(محمد) ﴿ﷺ﴾ لە موحەمەدی دەگرن، سوێند بێت بە خودا ئەگەر محمد ﴿ﷺ﴾ تف فڕێ بدات ئەوا بێگومان دەکەوێتە لەپی یەکێك لە هاوەڵانیەوە، ئەو هاوەڵەیش ئەو تفە دەهێنێت بە دەمو چاو و پێستیدا، هەر کاتێك فەرمانیان پێ بکات یەکسەر هاوەڵەکانی فەرمانەکەی جێ بەجێ دەکەن، کاتێك دەست نوێژ بگرێت دوور نییە لەسەر ئاوی دەست نوێژەکەی بکەنە شەڕ لەناو خۆیاندا،کاتێك لە خزمەتیدا قسە بکەن دەنگیان نزم دەکەنەوە، ئەوەندە گەورە بەڕێزە لای هاوەڵەکانی ناتوانن پڕ بە چاو تەماشای بکەن لەبەر ئەوەی زۆر بەڕێزە لایانو شەرمی لێ دەکەن)[1].

بەڵام موسوڵمانی ئێستاکە هیچ شارەزانین بە ناسینی پێغەمبەرەکەیان ﴿ﷺ﴾ کەناوی چیە و بۆچی خوای گەورە ناردوویەتی؟، بەڵام بەپێچەوانەوە ناوی یاریزان و ئەکتەری فیلم و گۆرانیبێژە فاشلەکان هەموو دەزانن!.

مەلایەك گوتی: چوم ژن مارە بکەم، لەکورەکەم پرسی پێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾ ناوی چیە؟ گوتی: مامۆستا من موسوڵمانم هەمووشت ئەزانم، گوتم: کەوایە هەمووشت ئەزانی ناوی چیە، گوتی: پێغەمبەر ناوی (الله) یە! گوتم: جاوەرە شێت مەبە موسوڵمانەو نازانێ خوای گەورە پاشان پێغەمبەر لێك جیابکاتەوە.

[1] - (رواه البخاري: ژمارەی فەرموودە: ٢٥٨١).





بەڕاستی جێی داخە بۆ موسوڵمانی ئەم سەردەمە کەزۆر پشتێکەرن لە ئیسلام و ڕابەرەکەیان، ئەم پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ خەم خۆری ئوممەتەکەیەتی لەدونیا و دوارۆژدا، کاتێك دونیا خراپ بوو کاتی لێپرسینەوە و حەشر و حیساب دێت بابزانین هەڵوێستی ئەو سەرکردەیە چۆنە، تەنها خەمی خۆیەتی یان ماڵ و خێزانی.

(قەتتادە) یان (کەعب) ئەڵێت: ئەو ڕۆژی کە خەڵکی لە بەردەم بارەگای خوا ڕائەگیرێن، گوێم لە حەسەنی بەسری بوو ئەیگوت: چی ئەڵێیت بەو کەسانەی کە پەنجا هەزار ساڵ بە بێ خواردن و خواردنەوە، ڕا ئەگیرێن، هەتا گەرووبان لە تێنوێتیەوە ئەپچڕێت، هەناویان گڕ ئەگرێت لە برسان، کانیەك شك ئەبەن کە پێی ئەڵێن: (آنیة) ئەچن لێی بخۆنەوە زیاتر گڕوو تینیان پێ هەڵئەسێت، تا بێ هێزی تەواو ڕوو لە هەمووان ئەکات و خەڵکی لە خۆ بێزار ئەبن. ئینجا خەڵکەکە هەر کەسەو هەڵدەسێت، بە دوای خۆشەویستێکی خۆیدا ئەگەڕێت، کە لە دونیا چاکەیەکی لە گەڵدا کردبوو، ئەمڕۆ بتوانێت، یارمەتی بدات و لەو ڕۆژی ڕزگار بکات، جا یان بخرێنە بەهەشت و یان بخرێنە دۆزەخ، گشت خەڵکی ڕا ئەکەنە لای ئادەم، پاشان ئیبراهیم، ئینجا موسا و عیسا (سەلامی خوایان لێبێ) کەچی هەموو ئەوانە ئەڵێن: ئەمڕۆ خوای گەورە بەجۆرێك تووڕە بووە، کە قەت لەمەو پێش بەو شێوە تووڕە نەبووە، هەموو تێکڕا باس لە توڕەیی خوا ئەکەن، بۆیە هەموو ئەڵێن: (نفسی نفسی)، هەر کەسەو بە نەفسی خۆیەوە سەر قاڵ ئەبێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا﴾[1]. واتە: ڕۆژێك دێت کە هەموو کەس خەمی خۆیەتی، بەرگری لە خۆی دەکات، پاکانە بۆ خۆی دەکات، گوێ بەکەسی تر نادات.

بیربکەوە کە چۆن ئەو هەموو خەڵکە هەر هاواری نەفسی خۆیەتی، هیچ شتێکت لەو ڕۆژەدا گوێ لێ نابێت، تەنها نەفسی نەفسی نەبێت، ئای! دەبێ ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێکی سەخت بێت، چ ڕۆژێکی سامناك و ناڕەحەت بێت..!

[1] - سورەتی النحل ئایەتی (١١١).





بیربکەوە ئەو پێغەمبەرانەی کە خەڵکی پەنایان بۆ ئەبەن چ ڕێزێکیان هەیە لای خوا، کەچی ئەوەتا ئەوانیش هیچ شتێکیان بەدەست نییە، هەموو لە ترسی تووڕەیی خودا ناتوانن شەفاعەت بکەن. کەواتە تۆ کێیت؟ تو چییت؟ تو چ نرخێکت هەیە لە ئاست ئەو پێغەمبەرانە!!

تا خەڵکی بێ هیوا ئەبن لە هەموو شت، دێنە لای پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)داوای شەفاعەت و تکای لێ ئەکەن کە لای پەروردگاریان بۆ بکات، ئەویش هەڵدەسێت ئەچێتە لای پەروەردگاری و ئیزنی لێ ئەخوازێت و خوداش ئیزنی ئەدات ئینجا بۆی ئەکەوێتە سەر سوژدە و دەست ئەکات بە مەدح و سەنای خوای پەروردگار و لە خوا ئەپاڕێتەوە کە حەشر و (حیساب) لە گەڵ ئەو خەڵکەدا بکات، لە شوێنێکا دەفەرموێت، سێ دانەساڵ پێغەمبەر (ﷺ) سەر لەسەر سوجدە ئەبێت و لە خودا دەپاڕێتەوە، ئینجا خوا وەڵامی ئەداتەوە، یان لە شوێنی تردا دەفەرموێ: خەڵکەکە دێن و دەڵێن: ئەی موحەممەد،(ﷺ) تۆ پێغەمبەری خوایت، خاتەمی پێغەمبەرانیت، خودا لە گوناهی پێش و دواییت خۆش بووە، دە لای پەروەردگارت شەفاعەتمان بۆ بکە، ئایا نابینیت کە ئێمە لە چ ناڕەحەتێکداین؟ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: پاشان هەڵئەسم، ئەچمە ژێر عەرشی خواوەو ئەکەومە سوژدە بۆ پەروەردگارم، ئینجا خوا سوپاس و ستایشێکی چاکم ئەخاتە سەر زمان، کە لە پێش مندا نەیخستۆتە سەر زمانی هیچ کەسێکەوە، ئینجا خوا دەفەرموێ: ئەی موحەممەد، سەرت بەرز کە، داوا بکە پێت ئەدرێت، شەفاعەت بکە وەر ئەگیرێت، ئەڵێ: منیش ئەڵێم: ئوممەتەکەی خۆم.. ئوممەتەکەی خۆم ئەی پەروەردگار، ئەگوترێ: ئەی موحەممەد (ﷺ) دە هەڵسە لە ئوممەتەکەی خۆت کەسانێ کە هیچ حیسابێکیان لەسەر نییە، بۆ بەهەشت و لە دەرگای ڕاستییەوە بەڕێکە)[1].

---

[1] - (صحيح البخاري، ژمارەی فەرموودە: (٧٥١٠) ، صحيح مسلم، ژمارەی فەرموودە: ١٩٣).





بەڵێ بەدایك و باوکەوە قوربانی بین تەنها ئەوە غەمخۆرمانە لەدونیا و دوارۆژ، بۆیە ئەی بەندەکانی خوا ئەگەر سەرفرازی و خۆشبەختی دونیا و دوارۆژت ئەوێ دەست بە سوننەت و ئاکاری ئەو پێشەوایە بگرە، ماڵ ومندالت ڕێگاکەیان بخەرە سەر ڕێچکەو ڕێبازی ئەو رابەرە کەهەنگاو بنێن بەرەو ئاسۆی روون کەتاکە ڕێگایە تیشکی رووناکی نوری خوای پەروەردگار پارێزەری ڕێگاکەیانە تا ئەیانخاتە بەهەشتی پان و بەرین.

﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾[1]. واتە: هەر کەس گوێڕایەڵی خوا پاشان پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بەڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە.

کەوابوو باهەموومان بەوەفابین بۆ ئەو سەرکردە ئازاو جوامێرە کەچۆن لەغەمی ئومەتەکەی دایە، بۆیە بائێمەش پەیمان بدەین ڕاستگۆبین تاکو لە ژیانداین لەسەر ڕێبازی ئەو بژین و بمرین بۆئەوەی بێ بەش نەبین لەو بەهەشتەی کە پێغەمبەری خوای (ﷺ) لێیە، بە ئیزنی الله تعالی.

سلاو و رەحمەت و میهرەبانی خودای گەورە لەسەر پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) و هاوەڵان و پێشینە چاکەکان و سەرجەم تێکۆشەرانی دڵسۆزی ڕێبازی پاکی ئیسلام.



[1] - سورەتی الأحزاب ئایەتی (٧١).





# هەموو نەوەی ئادەمین!

ئەم سەردەمەی ئێستا کە تێدا دەژین سەرەڕای دوورکەتنەوەی موسوڵمان لەدینەکەی و پشتکردن لە خوای گەورە، مرۆڤایەتی پەنا بەخوای گەورە زۆربەیان لەخواپەرستیەوە بۆ شەخس پەرستی و پارە پەرستی و ژن پەرستی، دەیان جۆری تری پەرستن وازیان لەخودای تاك و تەنها هێناوە.

جۆرێکی تری پەرستن کە ئێستا بەناو موسوڵمانانیشی گرتۆتەوە بریتییە لە قەوم و عەشیرەت و بنەماڵە پەرستی، بەشێوەیەك وادەزانن خوای گەورە دونیای تەنها بۆ عەشیرەتی ئەوان دروست کردووە، تەنها ئەوان لەسەر زەوی بوونیان هەیە، هیچی تر نیە لەوەی خۆیان بەڕێزتر و بەناوبانگترو گەورەتربێت، ئەوان لەزێرو ئەڵماس دروستکراون و خەڵکانی تر لە ماددەی بێ بەها دروست بوونە!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ( كُلُّكُمْ لِآدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ )[1]. واتە: هەمووتان نەوەی ئادەمن وە ئادەمیش لە خۆڵ دروست بووە.

بێئاگایە لەوەی گشتی لەخۆڵ دروستبوونە بەفەرمانی خوای گەورە، بۆیە جیاوازی دووبەرەکی ڕق کەوتۆتە نێوان مرۆڤایەتی، خۆشویستنی دونیا و ڕق لێبونەوە لەمردن و بەدوور زانینی قیامەت کەوتۆتە دڵەکان، هەموو شتێك بۆتە واستەو واستەکاری و خزم خزمایەتی، گەر لەعەشیرەتی ئەوبێ ئەگەر هیچ مستەواشی نەبێت دەیکاتە بەرپرس، یان بۆ کاری خێر تەنها دەبێ لەخزمی خۆی بێت، گەر زۆر هەژاریش بێ خێریان پێنادات، یان بۆ ژن و ژنخوازی بەهەمان شێوە کچیان نادەن بەقەوم و عەشیرەتی تر بەمەش ڕێژەی قەیرەیی و مانەوەی کچان بەپیری ڕوو لەزیادبوون دەکات.

---

[1]- (أخرجه أبو داود في كتاب الأدب، ژمارەی فەرمووده: ٥١١٦).





ئێمەی موسوڵمان دین و بەرنامەیەکمان هەیە کە ئیسلامە، واتە: خۆ بەدەستەوەدان بەسەر و ماڵ و ڕازی بوون بە هەموو فەرمانێکی خوای گەورە، پاشان ڕازی بوون بەگشت دەقێکی ڕێساکەی و بێ بڕوابوون بەگشت یاسا و بەرنامەی تر.
خوای گەورە ئەم ئیسلامەی بەرەحمەت بۆ ناردین تاکو ڕزگارمان بکات لەناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەی ژیان، بۆیە مرۆڤ بەبێ بەرنامەی ئیسلام مانای مرۆڤایەتی نادات و دەچێتە ئاستی ئاژەڵ و درندەکان، کەتەنها بۆ حەزو ئارەزوو دەژین بەبێ ئەوەی لەمانای ژیان تێبگەن و خۆشی ڕاستەقینە ببینن کە پابەندبونە بەئیسلام و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).
ئینجا ئەگەر بێتو سەیری سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام بکەین، کە چۆن مرۆڤایتی ناخۆشی بەخۆیەوە بینی بوو گشتی گومڕاو غەرقی جەهل و نەزانی ببوون، ڕۆچوبوون لە نێو شیرك و کوفر و گومڕاییەکی ئاشکرا، هەرچی خراپە و تاوان هەیە ئەیانکرد، ئەوجا خوای پەروەردگار پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، تاکو مرۆڤایەتی بخاتە سەر ڕێگای ڕووناکی ئیسلام.
﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾[1]. واتە: هەر ئەو خوایە پێغەمبەرەکەی (ﷺ)خۆی ناردووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئاینی حەق و ڕاستیدا کە ئیسلامە، تا سەری بخات بەسەر هەموو ڕێسا و ئاین و بەرنامەکاندا.
بۆیە ئیسلام دژی ڕەگەز پەرستی و عەشیرەت پەرستیە، بەتێکڕا ئەوانەی دەبنە موسوڵمان گشتی بەبراو خوشکی یەکتر دادەنێت، گەر هەر یەکێکیان لەو پەڕی شەرق و غەرب بێت مادام ئیمانداره و خۆی تەسلیمی خوا کردووە.
﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾[2]. واتە: بێگومان بەڕاستی ئیمانداران گشتی برای یەکترن.

[1] - سورەتی الصف ئایەتی (٩).
[2]- سورەتی الحجرات ئایەتی (١٠).




(سەید قوتب) خوای گەورە لێی خۆشبێ، ووتەیەکی جوانی هەیە، دەڵێت: من سەر بە ئومەتێکم کەنەوەی یەکەمی بریتیی بوو لە ئەبو بەکری عەرەبی و بیلالی حەبەشی و سوهەیبی ڕۆمی و سەلمانی فارسی، ئومەتەکەی من یەك دانە ناسنامە دەناسێ ئەویش باوەڕ و عەقیدەیە.

بێگومان تاکە شتێك بۆ مرۆڤی موسوڵمان گرنگ بێت تەنها عەقیدەو بیروباوەڕە کە موسوڵمان لە تاریکی و نەزانینەوە دەگۆڕێت بۆ رووناکی ئیسلام و بەخشینی عەقل و بیرو هۆشێکی پاك و سەلامەت.

خوای گەورە بەهۆی بەرنامەی ئیسلامەوە موسوڵمانەکانی کردووە بەیەك جەستەو لاشە دڵەکانی هەموو بەیەکەوە دەبەستێتەوە بەپێ شەرع و یاسای خۆی، دڵەکانیان پڕدەکات لەخۆشەویستی یەکتر تاکو هەر یەکێك لەوان ببنە یەك جەستەو لاشە بۆ دینی خوا تێبکۆشن و سەرەنجام بەهەشتیان بکاتە خەڵات.

عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ):(مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى)[1]. واتە: (نوعمانی کوڕی بەشیر) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: نموونەی موسوڵمانان لە ناو خۆیاندا لە بەزەیی هاتنەوەیاندا بە یەکتریی و لە یەکتر خۆشوویستنیان و لە هاوسۆزیيان بەرامبەر بە یەکتریی وەکو یەک جەستەن، کە ئەندامێکی ئازاری دێت، هەر هەموو ئەندامەکانی تری جەستەکە تایان لێ دێت و شەونخوونی دەکێشن بۆی.

بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نمونەی موسوڵمان بۆ برا موسوڵمانەکەی وەك یەك جەستە دێنینتەوە، واتە یەکێکیان نەخۆش بوو ئازاری هەبوو، ئەوەی تر هەست بە ئازارو نەخۆشیەکەی براکەی دەکات، دڵی خۆش نابێت تاکو براکەی ئازاری لەسەر سووك نەبێت.

[1] - (البخاري ،الأدب، ژمارەی فەرموودە: ٥٦٦٥).




جوانترین نموونەی ئەم یەک جەستەییە لە سیرەی سەلەفی سالْحی ئەم ئوممەتەدا، کە یەکێکیان یەکێکی تریانی دەبینی وا دەگری، بۆی دەکەوتە گریان پێش ئەوەی لێی بپرسێت کە بۆچی دەگریت؟!!

(ئەبو جەهمی کوڕی حوزەیفەی عەدەویی) (خوا لێی رازی بێت) دەفەرموێ: (انْطَلَقْتُ يَوْمَ الْيَرْمُوكِ أَطْلُبُ ابْنَ عَمِّي، وَمَعِي شَنَّةٌ مِنْ مَاءٍ، وَإِنَاءٌ، فَقُلْتُ: إِنْ كَانَ بِهِ رَمَقٌ سَقَيْتُهُ مِنَ الْمَاءِ، وَمَسَحْتُ بِهِ وَجْهَهُ، فَإِذَا أَنَا بِهِ يَنْشَغُ، فَقُلْتُ لَهُ: أَسْقِيكَ؟ فَأَشَارَ أَنْ نَعَمْ، فَإِذَا رَجُلٌ يَقُولُ: آهِ، فَأَشَارَ ابْنُ عَمِّي أَنِ انْطَلِقْ بِهِ إِلَيْهِ، فَإِذَا هُوَ هِشَامُ بْنُ الْعَاصِ أَخُو عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، فَأَتَيْتُهُ، فَقُلْتُ: أَسْقِيكَ؟ فَسَمِعَ آخَرَ يَقُولُ: آهِ، فَأَشَارَ هِشَامٌ أَنِ انْطَلِقْ بِهِ إِلَيْهِ، فَجِئْتُهُ فَإِذَا هُوَ قَدْ مَاتَ، ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى هِشَامٍ، فَإِذَا هُوَ قَدْ مَاتَ، ثُمَّ أَتَيْتُ ابْنَ عَمِّي، فَإِذَا هُوَ قَدْ مَاتَ)[1]. واتە: لە غەزای یەرمووکدا لە دووی ئامۆزایەکم دەگەڕام، دەفرێک و کەمێکم ئاو پێمابوو، دەمووت بەڵکو ئەگەر برینداز بووبێت و هەناسەی تێدا مابێت فریای کەوم بیدەمێ ودەموچاوی پێ تەڕ بکەم، دۆزیمەوە، هەر وا بوو کە خۆم بیرم لێکردبوویەوە، لە گیانەڵادا بوو، رامکردە سەری پێم گوت: ئاوت بدەمێ؟ گوتی: بەڵێ. لەو کاتەدا گوێی لێ بوو پیاوێکی تر دەیووت: ئاااى.. ئامۆزاکەم ئاماژەی بۆ کردم کە بیدەم بەو، هەر دەیناڵاند.

دەبینم (هیشامی کوڕی عاصی) برای (عەمری کوڕی عاصە)، لەسەرە مەرگیدایە، پێم گوت: ئاوت بدەمێ؟ گوێی لە یەکێکی تر بوو هەر دەیووت: ئاااى، هیشامیش ئاماژەی بۆ کردم کە فریای ئەو کەوە (ئاوەکەی بە دەمەوە کە). خۆم گەیاندێ، فریای نەکەوتم، گیانی دەرچوو.

خێرا هاتمەوە لای هیشام، دەبینم ئەویش گیانی دەرچووە، گەڕامەوە سەر ئامۆزاکەم دەبینم ئەویش تەواو بووەو مردووە.

---

[1] - (الزهد والرقائق ، ژمارەی فەرموودە: ٥١٣).





ئەگەر سـەیری هاوەڵانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بکەین، کە هەریەکەو لە قەوم و هۆز و زمانێکی جیاواز بوون، بەبێ ئەوەی نەتەوەپەرست بن و بێ جیاوازی نێوان نەتەوەیان و ڕەنگ و شـێوە و زمانیان هیچ لەم شـتانە کاریان نەکردە سـەریان یەك گیان و یەك جەستە تێکۆشان بۆ بڵاوکردنەوەی پرۆگرام و یاسای خوای گەورە، بۆیە خوای گەورەی مرۆڤایەتی پێ ڕزگارکردن لەدەست زوڵم و خراپەی ستەمکاران، بۆخۆشی و بەختەوەری و گەیشتن بە ئاسوودەی ڕاستەقینە.
ئا ئەوە (گاوانی کوردی و بیلال حەبەشی وسەلمان فارسی و سوهەیبی ڕۆمی)،(ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێت) کە هەریەکەو پێش ئیسلام بوونیان بت پەرست و ئاگر پەرست و خاچ پەرست بوون لەوڵاتێکەوە هاتبوون، تەسلیم بوون بەخوای گەورە، بەرنامەی ئیسلامیان کردە یاسای ژیانیان، جا کاتێك لەدەست ئازار و ئەزیەتی کافرەکان کۆچ ئەکەن بۆ شـاری (مەدینە)، بەبێ ماڵ و پارەو بە تەنیاو پۆشاکێك کۆچیان کرد و دورکەوتنەوە لە خزم و کەس و کارو ولاتیان چوون بۆ وڵاتێکی تر، بۆ لای کەسانێك نەخزم و ناسیاریان بوون نەعەشیرەت و بنەماڵەی ئەوان بوون، بەڵکو پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بەفەرمانی خوای گەورە کۆچی پێکردن بۆ لایان.
ئینجا ئەوکات لە شـاری (مەدینە) پێغەمبەری خوا (ﷺ) برایەتی ئەخاتە نێوانیان، کە برایەتیەك لەسەر دین و تەقوا زۆر توندو تۆڵ دروست دەبێت، ئەنسارەکانی مەدینە هەموو ماڵ و سەروەتیان لەگەڵ برا موهاجیرە کۆچکردووەکان بەش دەکەن و ئەیدەن بەبراکانیان، کە خوای گەورە ئەم برایەتیە بەهۆی ئیسلام و ئیمانەوە خستە نێوانیان دڵەکانی پەیوەستکردن بەیەکەوە، لەکاتێکدا مرۆڤایەتی ئەو سەردەمی هیچ خۆشی و ئارامییەکی بەخۆیەوە نەبینی بوو.




خوای پەروەردگار باسی ئەو برایەتی و پەیوەندی ئیمانیە دەكات كە لەسەر دەستی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بە فەرمانی خۆی خستە نێو ئەنسار و موهاجیرەكان.
﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ﴾[1]. واتە: دڵەكانیشیانی بەست بەیەكەوە، ئەگەر هەرچی دارایی زەوی هەیە، هەر هەموویت خەرج بكردایە تا دڵەكانیانت پەیوەند بكردایە بە یەكەوە، ئەوە نەتدەتوانی ئەو دڵانە پەیوەست بكەیت بەیەكەوە، بەڵام خوا بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە خۆشی و یەكریزی و برایەتی لە نێوانیاندا بەرپاكرد.
بەڵێ خوای گەورە دەفەرمووێ گەر هەرچی سەروەت و سامانی دونیا هەیە بەخشرابا، هیچ كات برایەتیەك لەم شێوەیە دروست نەدەبوو لەسەر زەوی، بەڵام بەهۆی ئیسلامەوە خوای گەورە برایەتیەك ئەخاتە نێو موسوڵمانان لەپێناو خوا بۆیەكتر خۆیان ئەدەن بەكوشت، بۆیە دووژمنایەتی موسوڵمان و جوولەكەی مەدینە لەسەر ئازاردانی خوشكێكی هاوەڵی ئیماندار دروست بوو.
(ئیبن هیشام) لە (ئەبو عەونەوە) ریوایەتی كردووە، ئافرەتێكی موسوڵمان ملوانكەیەكی خۆی برد بۆ بازاڕی نەوەی قەینوقاع تاكو بیفرۆشێ لەوێ دانیشت، چەن جوولەكەیەك ویستیان گاڵتەی پێ بكەن ڕوخساری بەدەرخەن، ئەویش ڕوخساری نیشان نەدان، زەڕنگەرەكە دەستی برد و چمكی كراسەكەی بەست بەپشتیەوە، بێ ئەوەی ئافرەتەكە ئاگای لێبێ، كاتێك هەستا ڕۆیشت لاشەی بەدیار كەوت، جوولەكەكان دەستیان كرد بەگاڵتەو پێكەنین، ئافرەتەكە هاواری كرد، یەكسەر ئیماندارێك بەهانەیەوە هات خۆی كردە قوربانی شەرەف و ناموسی وخوشكی ئیمانداری دوكاندارەكەی كوشت، جوولەكەكانیش هەڵمەتیان دایە سەر ئەو موسوڵمانەو كوشتیان)[2].

---

[1] - سورەتی الأنفال ئایەتی (٦٣).
[2] - (ژیانی ئازیزمان _ حبیب محمد سعید ، لا ٧٠٨).





بۆیە جەنگ دروست بوو لە نێو موسوڵمان و جوولەکەی نەوەی قەینوقاع، ئەمەش هەمووی تەنها لەسەر شەرەفی خوشکێکی ئیماندار، نەخزم و قەومایەتی لەنێوانیان هەبوو نەهیچ پەیوەندیەکی دونیایی. بەڵام گەر سەیری مێژووی ئەوانە بکەین دووربوونە لە خوای گەورە و بەرنامەکەی چیان کردووە بەیەکتر، گەر سەیری سەرۆك و پادشاکان بکەین، لە پێناو پلەو پۆستی دونیایی کوڕ باوکی خۆی کوشتووە، برازا مامی کوشتووە تاکو خۆی ببێتە سەرۆك و پادشا.

بەڵام لە ئیسلام تەنها تەقوا و دینداری گرنگە گەر ڕەش پێستێك بوو بەس خاوەنی تەقوا و عیلم بوو ئەوە بەتێکرای موسوڵمانەکان دەیکەنە براو گەورەو ئیمامی خۆیان، بزانە ئەمە لەسەردەمی ئیمامی (عومەری کوری خەتابە) (ڕەزای خوای لێبێت) کە کارگوزار واتە خزمەتکارێك دەکەن بە بەرپرسی ناوچەیەك، تەنها بەهۆی شارەزای لە قورئان و ئیسلام کراوە بە کاربەدەست.

(عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ (ﷺ) أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الْحَارِثِ لَقِيَ عُمَرَ بِعُسْفَانَ وَكَانَ عُمَرُ يَسْتَعْمِلُهُ عَلَى مَكَّةَ فَقَالَ مَنْ اسْتَعْمَلْتَ عَلَى أَهْلِ الْوَادِي فَقَالَ ابْنَ أَبْزَى قَالَ وَمَنْ ابْنُ أَبْزَى قَالَ مَوْلًى مِنْ مَوَالِينَا قَالَ فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهِمْ مَوْلًى قَالَ إِنَّهُ قَارِئٌ لِكِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَإِنَّهُ عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ قَالَ عُمَرُ أَمَا إِنَّ نَبِيَّكُمْ (ﷺ)قَدْ قَالَ إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ )[1]. واتە: لە (عامری کوڕی واثلە) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: کە عومەر کردبووی بەکار بەدەست، (نافع)ی (عبدالحارث) لە (عەسفات) کە گەیشت بە عومەر گوتی: کێت کردووە بە کاربەدەست لەسەر خەڵکی ئەم دۆڵە؟ گوتی: (إبن لابزی) گوتی: (إبن لابزی) کێیە؟ گوتی: یەکێکە لە کارگوزارەکانمان گوتی: جا کار گوزارت کردووە بە جێنشینی خۆت لەسەریان؟ گوتی: ئەو کەسێکی قورئان خوێنە و شارەزای زانستی میرات بەش کردنە.

[1] - ( صحيح مسلم، ژمارەی فەرموودە: ٨١٧).





عومەر(ڕەزای خوای لێبێت) گوتی: ڕاستە کە پێغەمبەرەکەتان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: لەڕاستیدا خوا بەهۆی ئەم قورئانەوە چەند گەڵ و هۆزێك سەربەرز دەكات و چەندانی تریش نزم و نەوی دەكات.

بەڵێ تەنها بە هۆی ئیسلامەوە مرۆڤ سەربەرز دەبێت ئەگەر هاتوو بەندەیەکی ڕاستگۆ بوو لەگەڵ خوای خۆیدا، با ڕەش پێست بێ، لەو پەڕی شەرق و غەرب بێت کە تەقوای خوای هەبوو، ئەوە براوەیە و سەرفرازە لە دونیا و قیامەت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾دەفەرموێت: ( لَاّ فَرَقِّ بَيَنِّ عَرَّبِيٌّ وَلَّاّ إِعجّميّ ولا أبيض وَلَا أَسْوَدَ إِلَّاّ بِّاّلتقوى)[1].

واتە: جیاوازی نیە لە نێوان کەسێکی عەرەب و کەسێکی غەیرە عەرەب وە جیاوازی نیە لە نێوان کەسێکی سپی پێست و ڕەش پێستێکدا ئیلا بە تەقوا نەبێت.

بۆیە تاکە شتێك هەبێت لای خوای گەورە گرنگ بێت تەنها تەقواو کردەوەی چاکی مرۆڤەکانە تاکو لەسەری پاداشت بدرێنەوە، بەڵام مرۆڤ زۆر سپڵەو دونیا پەرستە خۆی هەڵدەکێشی بەجوانیەکەی یان بەسەروەت و سامانەکەی یان بەبنەماڵە و عەشیرەتەکەی، کەچی هیچ شتێك خۆی خاوەنی نیە و گشت شتێکی هی خوای گەورەیە، هەتا خودی خۆی لاشەی خوێنی دەمار و ماسولکەی هەموو بەفەرمانی خوای گەورە کاردەکات و ئاگادارە بەوەرینی گەڵای دار، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا﴾[2]. واتە: هیچ گەڵایەک نیە بکەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت.

کەوایە تۆچیت ئەی مرۆڤ شانازی بەشتێکەوە بکەی کەهی خۆت نەبێ، بەڵام شانازی بەئەخلاق و ڕەوشتەکەت بکە، بە ئیمان و عەقیدەکەت بزانە بەڕاستی لەسەر ڕێبازی خوای گەورەیت، چونکە ئەمە بەویستی خۆتە هەڵبژاردنی.

---

[1] -( صحيحه الألباني في "الصحيحة" (١٩٩/٦).

[2] - سورەتی الأنعام نایەتی (٥٩).





ئایە کەسێکی ژیرو ئاقڵ دەبی و ڕەوشتەکەت ڕێگەت نادا نزیك کاری خراپ ببەوە، یان شەڕاوی و کاری خراپ دەکەیە پیشەت و ئازاری مرۆڤەکان ئەدەی؟، بۆیە ئەوە بزانە هەموو قەوم و هۆزەکان هیچیان بەوویستی خۆیان نەبووە، چ زمان و چ ڕەنگ چ قەوم و شارێك دەکەنە مۆڵگەی خۆیان، بەفەرمانی خوای گەورە لەدایك بوونە هاتونەتە سەر زەوی بۆماوەیەك دواتر هەمووان جێی دەهێڵن!.

﴿ وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا ﴾[1]. واتە:خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن.

بەڵێ هەموو مرۆڤەکان بەبێ ویستی خۆیان لە دایك بوونە، هەموو کەس ئارەزووی دەکرد جوانترین مرۆڤبا لەدونیا، یاخود ڕەنگی چاوی جوانترین و، بالا بەرزترین، بنەماڵەی زۆرترینی سەرزەوی و بەناوبانگترین بایە، بەڵام خوای گەورە هیچ ئەو شتانەی بەلاوە گرنگ نەبوو، تەنها ئەوەی گرنگ بێت لای خوا تەنها تەقوایە، کە کام لەبەندەکانی زیاتر لەدونیا خۆی ماندوو دەکات بەدڵسۆزی بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و لێخۆشبوونی.

﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴾[2]. واتە: بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسەتانە کەزۆرتر لەخواترسەو فەرمانبەرداری فەرمانی خوایە.

بەڵام ئەو کەسانەی تەنها بەناو موسوڵمانن هەمیشە بەدوای ڕابواردن و خۆشی دونیاوەن، گەر لەماڵی خوابێ یا لەمزگەوت تەنها باس باسی قەوم و بنەماڵەیە، ئەگەر موسوڵمانێك بڕوات بۆمزگەوت نوێژبکات، پرسیاری لێدەکەن تۆ چ بنەماڵەو عەشیرەت و لەکام شێخی، هێندە قەومی خۆی خۆشدەوێ وادەزانێ بەتەنها قەومی ئەو لەسەر زەوی بوونی هەیە، بەڕاستی شەرمە بۆ موسوڵمان ئەوە ڕەوشتی بێت، گەرتۆ هێندە خۆت پێ شەریفە و ئیمانداره پرسیاری عەقیدەو یەکخواپەرستی لێبکە،

---

[1] - سورەتی النحل ئایەتی (٧٨).

[2] - سورەتی الحجرات ئایەتی (١٣).





بڵێ خودات کێیە و بۆچی دروستی کردووی؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هاتووە بۆ مرۆڤەکان؟ ئیسلام فەرمان بەچی دەکات و ڕێگری لەچی دەکات؟ خوای گەورە بۆ قورئانی دابەزاندووە بۆ مرۆڤەکان؟ ئەمەیە هەڵوێستی موسوڵمانی ڕاستگۆی شوێنکەوتەی ئیسلام، قەوم و قیلە و عەشیرەت و باوك و دایك و کەس و کارو خزمی دەکاتە قوربانی بۆ خوای گەورە و دینەکەی.

﴿قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾[1]. واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: ئەگەر باوك و کوڕ و برا و ژن و عەشرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێک کە بەدەستتان هێناوە، یاخود بازرگانیەك دەترسن کە شکان و بێ بازاڕی ڕووی تێبکات و خانووبەرە و کۆشک و تەلارێک کە حەز دەکەن لێتان تێک نەچێت و دڵخۆشن پێی و خۆشتان دەوێ، لاتان خۆشەویست ترو نازدارتر بێت لە خوا پاشان پێغەمبەرەکەی و جیهادو تێکۆشان لەپێناو ڕێبازی ئەو زاتەدا، دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا خوای گەورە سزاتان بۆ دەنێرێ خوای پەروەردگاریش هیدایەت و ڕێنمویی قەومی یاخی و لە سنوور دەرچوو ناکات.

بۆیە بەغەیری تەقوا و یەکخواپەرستی هیچ شتێکی تر بەلای خوای گەورە گرنگ نیە نە ناوبانگ و پلەو پۆستی دونیای نەجوانی و زۆری پارەو سەروەت.

کەوابو ئەی بەندەی خوا دڵ خۆشبە کەتۆ سەر ڕاستانە دڵەکەت پەیوەستە بە خوای گەورە و دینەکەی، غەم مەخۆ ڕەنگت چۆنە، شێوەت و زمانت چیە، و بنەماڵەو هۆزت بێ ناوبانگە.

[1] - سورەتی التوبة ئایەتی (٢٤).





سەیربکە و بیری لێبکەوە بزانە خوای گەورە لەقورئانەکەی باسی پیاوێکی ئیماندار دەکات کە بەقەومەکەی دەڵێت: بەدەم بانگەوازی پێغەمبەرانەوە بچن و تەنها خوای تاك و تەنها بپەرستن، بزانە ئەم کەسە خوای گەورە بەرزگارکەری میلەتەکەی باسی کردووە، بەڵام چ سیفات و ئاکار و نەسب و عەشیرەتی لەگەڵ باس نەکردووە.
﴿ وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴾[1]. واتە: ئەوسا لەوپەڕی شارەوە پیاوێکی ئیماندار بەپەلە، بە گورج و گۆڵی هات و گوتی: ئەی قەومەکەم ئەم پێغەمبەرانە ڕاست دەکەن، ئەم پەیامبەرانە ڕاست دەڵێن شوێنیان بکەون، بڕوایان پێ بکەن، ئیمانیان پێ بهێنن.
بزانە خوای گەورە باسی ڕەنگ و شێوەی پیاوەکەی نەکرد، نەیفەرموو پیاوەکەی فلانە قەوم و بنەماڵە، یان فلانە زمان بوو، یان خزمی فلانە پادشابوو نەخێر تەنها پیاوێکی ئیماندار بوو داوای کردوە بەدوای بانگەوازی پەیام هێنەرەکانی خوای گەورە بکەون، کەبانگی خەڵکی دەکەن بۆ ڕێگای سەرفرازی و بەختەوەری.
بۆیە ڕەحمەتت لێبێت بزانە تەنها ئەو کەسانە بەڕێزن لای خوای گەورە کە لەخودا ترس و موتتەقین. (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، (رضي الله عنه)، قَالَ : سُئِلَ رَسُول اللَّهِ (ﷺ)مَنْ أَكْرَمُ النَّاسِ ؟ قَالَ : أَتْقَاهُمْ)[2]. واتە: لە (ئەبو هورەیرەوە) (ڕەزای خوای لێبێت) : دەفەرموێت: پرسیان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڕێزترین خەڵك کامەیە، فەرمووی: تەقوادارترینیان.
بەڵێ ئەوکەسە بەڕێزترینە کە لەخوا ترسە با ڕەش پێستێك بێت لەو پەڕی شەرق و غەرب بێت لەناو کۆشك و تەلار بێت یان ئەشکەوت و ژێر زەوی، ئەوەی گرنگە تەنها موسوڵمانەو لەخوا ترسە و لەسەر ڕێبازی تەوحیدە، لە دینی ئیسلام لەنێوان ئەو قەوم و هۆزانەی سەر زەوی هیچ شتێک جیاوازی نیە لای خوای پایەبەرز نەزمان نە ڕەنگ، نە قەوم نە شێوە تەنها تەقوا و لەخواترسان نەبێت.

---

[1] - سورەتی یس ئایەتی (٢٠).

[2] - ( صحيح البخاري ، ژمارەی فەرموودە: ( ٣٣٥٣)، صحيح مسلم، ژمارەی فەرموودە: (٢٣٧٨).





پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَلاَ إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ، وَإِنَّ أَبَاكُمْ وَاحِدٌ، أَلاَ لاَ فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِيٍّ ، وَلاَ لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ ، وَلاَ لأَحْمَرَ عَلَى أَسْوَدَ ، وَلاَ أَسْوَدَ عَلَى أَحْمَرَ إِلاَّ بِالتَّقْوَى)[1]. واتە: ئەی خەڵكینە، خودای ئێوە یەكە، وە باوكتان یەكە، عەرەبێك لە ئەعجەمیەك زیاتر نیە، وە ئەعجەمیەك لە عەرەبێك، وە سوورپێستێك بەسەر ڕەش پێستێك، وە ڕەشێك بەسەر سووردا جگە تەقوا و خواپەرستی نەبێت.

وە ئەو كەسانەش كچی خۆیان نادەن بە گەنجی موسوڵمان، كە تەنها لەبەر ئەوەی لە قەوم و عەشیرەتی ئەوان نیە، بۆیە بەوكارەیان تەنها غەم و خەفەت بۆ خۆیان و كچەكەیان زیاد دەكەن.

چونكە زۆرێك لە كچانی ئەم سەردەمە پیربوونەو بێ مێرد ماونەتەوە، قەیرە بوونە كەس نیە هاوسەرگێریان لەگەڵ بكات بەهۆی هەڵكێشانی تەمەنیان و مانەوەیان بەكچی بەكۆڵی خۆیان دەمێنێتەوە، چی دەبێ گەر كچیان بدەن بەموسوڵمانێكی دڵسۆزی غەیرە عەشیرەتی خۆیان تاكو خزمایەتی پتەو بەهێزبێت لە نێو موسوڵمانەكان، گشتیان ببنە یەك پشت و تێبكۆشن بۆ سەرخستنی دینی خودا.

كەوابوو ئەی بەندەی خوا بزانە لەڕۆژی دوایی خوای گەورە سەیری قەوم و هۆز و پلەو پایەت ناكات، وەرە كوڕی كام شێخ و بنەماڵە بوویت، زمانت چی بوو عەرەب بووی یان كورد، یان ڕەنگ و شێوەت سپی بوو یا سوور، نەخێر بەڵكو سەیری دڵ و كردەوەت دەكات، وەرە داخۆ چەن بۆخوا ژیاویت لەدونیایی كاتی تەمەنت لە چ كارێكی باش و خراپ بەسەربرد.

[1] - (رواه أحمد وصحيحه الألباني في "الصحيحة" (١٩٩/٦).





هەروەك پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)دەفەرموێ: ( إِنَّ اللَّهَ لا يَنْظُرُ إِلَى صُــوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَإِنَّمَا يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ)[1]. واتە: خوای گەورە سـەیری شـێوە و وێنەتان و ماڵ و موڵکتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵتان و کردەوەکانتان دەکات.

بەڵێ ئەی موســوڵمان ڕەحمەتت لێبێت بزانە ســەیری دڵت دەکات واتە بزانێ دڵتان حەسودی و دووڕویی و گومانی خراپی تێدایە یان بەپێچەوانەوە دڵێکی ساغ و سەلیم و لەخواترســە، ســەیری ســەروســیما ناکات واتە ســەروســیمای جوان و باڵاو هەیکەلی نایاب مرۆڤ خۆشــەویســت ناکات لای خودا و پێی ناچێتە بەهەشــت، وە ســەروەت و سامانیش بەهەمان شێوە مەگەر لەپێناو خودای گەورە ببەخشرێت.

کەوایە زانیمان بۆ هاتوینە دونیا تاوەکو تاقیبکرێینەوە بۆ دونیاکەی تر کەقیامەتە نەک بۆئەوە هاتبن تا بە هۆزو قەوم خۆمان بەســەر خەڵکانی تر بەگەورە بزانین و بەچاوی کەم ســەیریان بکەین، کەوابوو تاکو زووەو درەنگ نەبوە مردن نەبۆتە میوان بابەندەی خودای گەورە بین بە دڵســۆزی خۆمان بۆی یەکلا بکەینەوە تاکو لەقیامەت لە ڕیزی دەستەی سەرفرازان بین، بەئیزنی الله تعالى.

[1] -(رواة مسلم، ژمارەی فەرمودە: ( ٢٥٦٤ ).





# نامۆبوونی ئیسلام لەم سەردەمە!

بەڕاستی لەم ڕۆژگارە کۆمەڵگەو ماڵی موسوڵمانان زۆربنەیان گۆڕاون، سیماو ئەخلاقی ئیسلامەتی لەنێو ماڵەکان بەزۆر کۆچیان پێکراوە، زۆربەی ماڵەکان لەم ڕۆژگارە دوورە پەرێزن لە بەرنامەی خودای گەورە کە ئیسلامە، موسوڵمانان هیچ ئاکار و ڕەوشتی جوانیان پێوە دیارنیە کە بە گوێرەی بەرنامەی ئیسلام بێت، نە لە کردەوە نە لە ڕووخسار و شێوەیان، کەوتوونەتە دوای ڕەوشتی رۆژئاوا و بێباوەڕان لەهەموو سیفات و ئەخلاقی ڕۆژانەیان، لە خۆ ڕازاندنەوەیان، لە مۆدیل و ستایلیان، لە جل و بەرگیان، لە سەرچاکردن و، لە هەموو جوڵانەوەیەکیان پەیڕەوی بێ بڕوایان و دونیا پەرستەکان ئەکەن.

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ، شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ لَاتَّبَعْتُمُوهُمْ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، آلْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ: (فَمَنْ)[1].

واتە: (أبو سعیدی الخدری) (ڕەزای خوای لێبێت)دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: بێگومان لەمەولا دەکەونە شوێن خوو نەریتی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون بست بە بست و، گەز بە گەز، تا وەکو بەڕادەیەك ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن بە کونی بزن مژەدا ئێوەش شوێنیان دەکەون. وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گاور و جوولەکەکان؟ فەرمووی: ئەی کێ؟.

ئیسلام لەم سەردەمەی ئێستادا پەیڕەوانی ڕاستەقینەی زۆر کەم و نامۆ بوونە، زۆربنەی خەڵکی هەوڵی ئەوە نادەن فێربن و لەحەقیقەتی تێبگەن.

[1] - (رواه بخاري، ژمارەی فەرموودە: (٣٢٦٩).




کەبۆ بەختەوەری مرۆڤایەتی هاتووە، موسوڵمانان لە هەموو لایەکەوە تەنها بۆ بازاری دونیاو مەبەستەکانی هەوڵ و ماندوو بون و شەونخونی دەکەن بۆ بەدەستهێنانی شتە دونیاییەکان، بۆ بڕوانامەیەك دەیان ملیۆن ئەدات تا بەدەستی بێنێت بەبێ ئەوەی ئەم بڕوانامەیە سودی بۆی هەبێت، نە ئەتوانێ ئیشێکی پێ بکات نە دابمەزرێت، نیوەی تەمەنی لێ بەفیڕۆ ئەچێت بەخوێندنی دونیایی،کەچی هەوڵی فێربوونی بەرنامەی ئیسلام نادات کە سەرفرازی و خۆشبەختی دونیا و قیامەتی پێوە بەندە، ڕۆژێك هەوڵیان نەداوە فێری ئیسلام بن، تەنها زاناو شارەزان بە دونیا و شتە دونیاییەکان، ناوی ئەکتەری فیلم و سینەماو، یاریزان و یانەکان هەموو دەزانێت.

﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾[1]. واتە: تەنها لە ڕووکەشی ژیانی دونیا تێگەیشتونەو شارەزان، لە بەرامبەر ژیانی قیامەتیشەوە بێئاگان.

جا ئیسلامەکەمان نامۆ و غەریب بووە، خەڵك سەیری ئیماندارێك دەکات لەسەر سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ) ڕیشی بەرداوە، یان سیواك دەکات، یان عەباو پۆشتەیە قسەی ڕەق و تانە و تەشەری لێدەدەن، چونکە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر کەمیان پەیڕەوی دەکەن، نەشارەزان پێی نەزانیاری تەواویان دەربارەی هەیە، بەهۆی ڕوو لە دونیاکردنیان بۆیە لە ئاخیر زەمان خەڵك دوورە پەرێزن لە ئیسلام، لە ماڵ و مەجلیس و کۆڕو کۆبونەوە، هیچ باسی یادو زیکری خودای گەورە، مردن و قیامەت ناکرێت، بەڵکو باس باسی دونیا و ژن وسەیارە و خانو و قاپ و قاچاخی ناوماڵ و شتە دونیاییەکانە.

بەڵام گەر گەنج نیوەی کابۆی سەرچۆکی دڕابێ و سەری نیوە چاکردبێ و ڕیشی وەك گەنجانی ڕۆژئاوا بەشێوەی ئەوان چاك کردبێ هیچ قسەی پێ ناڵێن دەڵێن: کاکە وازی لێبێنە مۆدێلەو گەنجە هێشتا بابەدڵی خۆی بکات!.

[1] - سورەتی الروم ئایەتی (٧).





کەچی ئیماندارێك ڕیشی و شەڕواڵی کورت بێ بەشێوەی سوننەتی لەسەر ڕێگا و ڕێبازی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت سەد تانەو تەشەرو ئیهانەی پێ دەکەن گوایە توندڕەوو داخراوە، لەخودای گەورە ناترسێن ئەمانە بۆ چاولێکەری کابرای نێرباز دەڵێن مۆدێلە بەس بۆ سوننەتی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) توندڕەو تۆقێنەرە.

بۆیە ئیسلام غەریب بۆتەوە لەناومان، واتە نامۆیە بێ کەس و بێ پشتیوانە، ئەوانەی پابەندن بە ئیسلام بەڕاست و دروستی زۆرکەمن، هەروەك سەرەتای هاتنی ئیسلامە کە چەن کەسێکی کەم لەدەوری پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆببوننەوە ئەوانەی تر بە دڕندەترین شێوە دژایەتیان ئەکردن بە لێدان و سزادان بەئاگر و بە ئاسن هەوڵی بنەبڕکردونیان ئەدا کە بڵاونەبێتەوە، بۆیە ئەوکاتە پێی دەگوترا سەردەمی غەریبی و نامۆیی، چونکە بێکەس و پشتیوان بوون، شوێنکەوتەی ئیسلام زۆر کەم بوون ئێستاکەش بە هەمان شێوە سەردەمی غەریبییە، کە ئاخیر زەمان و قیامەت نزیك بۆتەوە.

بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدایك و باوکەو بەقوربانی بین ئاماژەی بەم سەردەمە کردووە بەوەی دووبارە نامۆیی و غەریبی سەر هەڵدەداتەوە موژدەی داوە بەو غەریبانە لەکۆتا زەمان بێکەس و نامۆن و سەر ڕاستانە شوێنکەوتەی ئیسلامن.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(ﷺ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) : (بَدَأَ الإِسْلاَمُ غَرِيباً، وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيباً، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ)[1]. واتە: لە (ئەبو هورەیرەوە) (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: سەرەتای هاتنی ئیسلام بە غەریبی بوو، وە بە هەمان شێوە دەگەڕێتەوە بە غەریبی، خۆشبەختی و سەرفرازی بۆ غەریبەکان.

ئێستاکە ئەچیتە هەر ماڵێك باس و خواسی دونیا و ڕابواردن و غەیبەت و فەسادییە، تیڤیەکانیان سینەماو فیلمی دوور لە ئەخلاق و ڕەوشتی ئیسلام بێ ئاگای کردوون پێیەوە سەرقاڵن.

---

[1] - أخرجه مسلم، ژمارەی فەرموودە: (١٤٥).





ئەوجا سەیری خێزانەکەیان بکەی کچ و دایك و خوشك و هاوسەریان هەموو سفورو جلی نیمچە ڕووتیان پۆشیوە، ئەی برای من سوێند بە خودای گەورە بەر پرسیاری لە قیامەت بەرامبەر بەو بێ هەڵوێستیەت بەرامبەریان، کە چۆن خێزانەکەت دورکەوتونەتەوە لە بەرنامەی ئیسلام.

﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ﴾[1]. واتە: لەبارەگای خوا ئەمر دەکرێت بیانوەستێنن، بێگومان ئەوان بەر پرسیارن.

بەڵێ بەرپرسیاری لە دونیا و قیامەت کەچۆن بێدەنگیت هەڵبژاردبوو لە سفوری خێزانەکەت، بێدەنگیت هەڵبژاردبوو لە پەروەردەکردنی منداڵەکانت بە پەروەردەی ئیسلامی، لەو لاشەوە چۆن گورگەکان بەخۆڕازاندنەوەی خێزانەکەت چاوی برسی و نەفسی ناپوختیان پێ تێر ئەکرد.

بەداخەوە بۆ پیاوان کە خەمیان تەنها پارە پەیداکردن بێت و بەدوای ماڵی دونیاوە بن، وەبێ ئاگا بێت لە ژن وکچ و دایك و خوشکی، ئایە ئەم پارەو پولە چ سودێکی هەیە؟ لەم دونیاییە ئەم پارەو پولەت خۆشیەکی کەمت پێدەگەینێت، بەڵام لەقیامەت بۆت ماڵ وێرانی و تیاچوونە.

﴿مَا أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ﴾[2]. واتە: ئەوەتە ئەو ماڵ و سامانەی کە هەم بوو، فریام نەکەوت.

چونکە تۆ لە دونیا خوای گەورەت لەبیر کردبوو لە پێناو خۆشی دونیا و پارە پەیداکردن و خانوو بەرزکردنەوە، غەمت دین و ئیمان و قیامەت نەبوو، کچەکانت هەموو بە سفوری ئەچوونە زانکۆ و دەوام هەر ڕۆژەو بە مۆدێلێك، کوڕەکەت پارەی سەرف ئەکرد بە یاری قومار و بلیاردو مەشروباتی کحولی و ئارەق لەگەڵ هاوڕێ خراپەکانی هیچ هەڵوێستت نەبوو، خێزانەکەت بەجلی نیمچە ڕووت نمایش ئەکرد ئەت بردە باخچەی گشتی و گەشت وگوزارو سەفرە، بەبێ جل و بەرگی شەرعی،

---

[1] - سورەتی الصافات ئایەتی (٢٤).

[2] - سورەتی الحاقة ئایەتی (٢٨).





گورگەکانیش لەوێ بە ئارەزووی خۆیان سەیریان ئەکرد، ئاخر چۆن دەهێڵی خێزانت بۆغەیری خۆت جوانی بەدەر بخات بۆ خەڵکی خۆ تۆ ژنت بۆ خەڵك نەهێناوە تا بیکەیتە ریکلام و پیشانی گشت خەڵکی بدەیت!، بەداخەوە لەم رۆژگارەدا خۆمان بەدەستی خۆمان بێ رێز ئەکەین لە بەر چاوی خەڵك، زۆر بێغەمین لەئاست ئەخلاق و رەوشتی خۆمان و خێزانمان.

باسەیری پیاو و ئافرەتانی پێشینی سەلەف بکەین چۆن بۆ خوا ژیاون، چۆن خۆیان پاراستووە لە تاوان و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە.

بەداخەوە ئەم دوورکەوتنەوەیە لە ئیسلام تەنها پیاوانی نەگرتۆتەوە، بەڵکو ئافرەتانیش ئەم نەخۆشی و ڤایرۆسەی بەرۆکی گرتوون، هیچ ترسی خوای گەورە لە دڵیان نیە بۆیە بەدوای خۆشی دونیا کەوتوونە، دڵیان بۆ دونیا ترپەی دێ و ئەوانیش بەگوڕ و تین و هێزەوە هاتوونەتە مەیدانی زۆرانبازێ لە خۆدەرخستنیان بۆ بازاڕی دونیایی، بەسەر پەرشتی مامۆستای گومڕاکەری باوکە ئادەم شەیتانی نەفرەتی، بەڵام ئەگەرسەیری حاڵی ئافرەتانی سەلەف بکەین چۆن پەردەی دڵیان سووتابوو لە ترسی خوای گەورە، چۆن هەڵوێستی مەردانەیان نواندووە لە وشیارکردنەوەی پیاوەکانیان بەترساندنیان بەگەڕانەوە بۆ لای خوا.

(ئیبن جەوزی) (رەحمەتی خوای لێبێ) دەفەرمووێت: عومرەی خێزانی حبیبی العجمی کاتێک شەوان هەڵدەستا لەخەو بە پیاوەکەی دەوت: هەستە ئەی پیاو: ئەوە شەومان رۆیشت وە رێگاکە دوورە و توێشمان کەمە وەقافڵەی چاکەکاران بەرێ کەوتون و ئێمە بەجێ ماوین.[1]

بەراستی ئەو کاتانەی کە ئەم جۆرە ئافرەتانە دایك و خوشك و کچ و هاوسەرەکانی نێو کۆمەڵگەی موسوڵمانان بوون، هەمیشە ئیسلام و موسوڵمانان لە ئاستێکی زۆر بەرزی گەشەکردندا بوون لەڕوی زانست و حوکم و سیاسەت و ئەخلاق و پەروەردە،

---

[1] - (صفة الصفوة: ٣٥/٤).





بۆیە لەنمونەی کەڵەپیاوان و زانایانی گەورەی ئیسلام دروست دەبون و کۆمەڵگەشیان پەروەردە دەکرد لەسەر شەریعەتە جوانەکەی ئیسلام.
بەڵام بەداخەوە جیلی ئافرەتانی ئەمڕۆش بەرامبەر بە پیاوان ئەوانیش کەوتوونەتە دوای ڕابواردن و خۆشی دونیایی و داوی شەیتان و ئارەزووی نەفسیان، بە شوبهە و گومانی خەڵکانێکی بێدین هەڵخەڵتاون بە وەعدو بەڵێنی درۆ لەماڵ دەریان هێنان و لەو ئەرکە جوانەی دایکایەتی دوریان خستنەوەو کردیانن بەکاڵایەکی کەم بەها لەنێو بازاڕەکانی ویست و حەزەکانی خۆیان، مامەڵەو کڕین و فرۆشتنی حەزەکانیان پێوە دەکرێت هەر ڕۆژە لەژێر ناو ناونیشانێکدا، بەڵام بەداخەوە بە ئاگا نایەنەوە لە خەوی غەفڵەت.
تکایە ئەی براو خوشکانی من ڕەحمەتان لێبێت قیامەت و حەشرو حیساب زۆر سەختە، بەرگەی ناخۆشی و ئازاری ناگرین بۆیە بەئاگا وەرنەوە لە خەوی غەفڵەت و بێ ئاگای خەمێك لە قیامەتتان بخۆن پەروەردەی دایك و خوشك و کچ و هاوسەرەکانتان بکەن لە قوتابخانەی ئیسلام، سوێند بە خوا نەیان بەن بۆ ئەم قوتابخانەیە تاوەکو بەجوانترین شێوە پەروەردەبکرێن سەر شۆڕی دونیا و قیامەت ئەبن، چونکە تاکە قوتابخانەیە باشترین پەروەردەو وانەی بۆ مرۆڤایەتی پێیە، بەبێ هیچ پاداشت و بەخششێك قوتابیەکانی دەباتە بەرزترین ئاست لەهەموو ڕووێکەوە.
بۆیە تاوەکو زووەو نەمردووینە بابگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورەو دەست بە ئیسلام و شەریعەتەکەیەوەی بگرین و با هەموو هەوڵمان بۆئەوە بێت فێری ئیسلام بین فەرمانەکانی خوای گەورە لەخۆمان بێنینە دێ، هەرچی دەزانین لەبەرنامەکەی خوای گەورە بلاوی بکەینەوە، تاوەکو لە قیامەت بە باشترین شێوە پاداشتمان بدرێتەوە بەبەهەشتی فیردەوس، بە ئیزنی الله تعالی.




# پاشەڕۆژ هەر بۆ ئیسلامە

ئەم ژیانەی دونیا خوای گەورە دروســتی کردووە بۆ مرۆڤەکان تاکو تاقیان بکاتەوە، بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی و مل کەچ بوون بۆ یاســاو شــەریعەتەکەی، یاخود پشــتکردن لەفەرمانەکانی و دژایەتیکردنی ڕێساو بەرنامەکەی کە ئیسلامە.

﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾[1]. واتە: ئەو خوایەی خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندتر ئەنجام دەدات.

ئینجا ئەم دونیایە هەرچی تێیدایە لە ئاسمان و زەوی هەموو موڵکی خودایە، خۆرو ڕۆژ، مانگ، ئەستێرە، باو باران، دارو بەرد، ئاو، ئاگر، هەرچی گیانی لەبەرە و بێ گیانە گشتی دروستکراوی خوای گەورەن لەژێر فەرمانی خۆیەتی.

﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[2]. واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە و ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەمووشتێکدا هەیە.

ئینجا خودای بەرەحم و بەسۆز بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بەخۆشی لەدونیا بژین گشت شتێکی بۆ رام کردوون، باران، با، گژوگیا، ئاژەڵ، جۆرەها داروو بەروبوم، هەرچی لە دونیا بونی هەیە هەمووی لە پێناو مرۆڤەکان خستۆتە ڕوو تاکو ژیان بەخۆشی تێدا ببەنە سەر.

لەپاش ئەو هەموو چاکەو بەخششەی خودای گەورە کە بەخشیویەتی بەبەندەکانی، بەڵام مرۆڤەکان بەگشتی بەرامبەر بەنیعمەتەکانی خودای گەورە زۆر ناشوکر و بەندەیەکی گوێرایەڵ نین بۆ فەرمان و بەرنامەی خودای گەورە.

---

[1] - سورەتی الملك ئایەتی (٢).

[2] - سورەتی ال عمران ئایەتی (١٨٩).

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْأَنْهَارَ﴾[1]. واتە: ئەو خوایە کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە، لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە بەهۆیەوە بەروبوومی لەناخی زەوی بۆ ئێوە دەرهێناوە، هەروەها کەشتی لە دەریادا بۆ ئێوە بار هێناوە تا فەرمانی ئەو زاتە بڕوات بەسەریەوە، هەر خوایە بەدیهێنەری ئەو مادە سەرەتاییانەی کە کەشتی لێ دروست دەکرێت، هەر ئەوزاتەیە بەدیهێنەری وزەو ئاوو هەوا...هتد، هەروەها ڕووبارەکانیشی بۆ ڕام کردوون (کە جۆرەها سوودیان هەیە بۆتان).

ئینجا لەدوای ئەو هەموو بەخشینەی خودای گەورە بۆ مرۆڤەکان لە خۆشترین خواردن و جۆرەها نازو نیعمەت کە ژماردنیان لەکۆتایی ناهێت، خودای گەورە ڕێزی مرۆڤی نا بەسەرگشت بونەوەرەکان لەجنۆکە و ئاژەڵ و گشت بونەوەرەکانی تر.

﴿وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾[2]. واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزی زیادەی ئەوانمان داوە بەسەر زۆربەی ئەو بەدی هێنراوانەدا کە دروستمان کردوون، تا قەدرو ڕێزی خۆیان بزانن.

لەپاشان خودای گەورە پەیام و بەرنامەی خۆی بە پێغەمبەرانی نارد بۆ مرۆڤەکان تاکو ئاگاداریان بکاتەوە، تەنها خوابپەرستن و عیبادەت و بەندایەتی تەنها بۆ ئەو بکەن و شوێن ڕێساو یاسای ئەو بکەون، تاکو بەژیانێکی خۆش پاداشتیان بداتەوە لە دونیا و دوارۆژ.﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ﴾[3]. واتە: سوێند بەخوا بێگومان ئێمە پێغەمبەرەکانمان ڕەوانەکردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگە و نیشانەو موعجیزەی ڕوون و ئاشکراداو کتێبە ئاسمانەکانیشمان هێنایە خوارەوەکەلەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا بێت، تەرازوو پێوەری شەرعی و دادپەروەرانەمان بۆ ڕوون کردونەتەوە تاوەکو خەڵکی بەدادگەری و دادپەروەریی ڕەفتار بکەن.

---

[1] - سورەتی ابراهیم ئایەتی (٣٢).
[2] - سورەتی الاسراء ئایەتی (٧٠).
[3] - سورەتی الحدید ئایەتی (٢٥).

بەڵێ خودای کارزان لەپاش ناردنی پێغەمبەرەکان (سەلامی خودایان لێبێت) بۆ گەل و نەتەوەکانی سەردەمی خۆیان، کەبانگەوازی بکەن بۆ ڕێگری لەشیرك هاوەڵ و هاوبەش بریاردان بۆخودای گەورە، پاشان فەرمان بکەن بەخەڵکی بەچاکە و چاکەکاری لەگەڵ یەکتری بەجوانترین شێوە هەڵسوکەوت بکەن.

﴿قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُم مِّنْ إِمْلَاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾[1]. واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ: خەڵکینە وەرن با ئەو شتانەتان بۆ بخوێنمەوە کە پەروەردگارتان حەرامی کردووە لەسەرتان، (یەکەمیان) کە هیچ شتێک نەکەن بەشەریك و هاوەڵ بۆی، (دووهەمیان) کە چاک ڕەفتار بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا، (سێهەمیان) منداڵانی خۆتان لەبەر برسێتی و نەداری مەکوژن، چونکە ئێمە پەکتان ناخەین ڕزق و ڕۆزی ئێوەش و ئەوانیش دەدەین، (چوارەمیان) نزیکی گوناهو تاوانەکان مەکەون، چ ئاشکرا یا پەنهان بووە، (پێنجەمیان) هیچ کەسیش مەکوژن کە خوا حەرامی کردووە مەگەر بەحەق نەبێت، ئەوەی کە خوێندمەوە بۆتان خوا فەرمانی پێکردوون بۆ ئەوەی ژیرو هۆشمەند بن.

لەپاشان خودای گەورە نازو نیعمەتی زۆری ڕشتوە بەسەر مرۆڤەکان، ئەگەر بێت و نازو نیعمەتی خوای گەورە بژمێرین لەژیانی دونیا کەبەخشیویەتی بەبەندەکانی ناتوانین، چونکە هەر لەخودی مرۆڤ نیعمەتی بێ ژمار هەیە، هەر لەنیعمەتی بۆن ئەگەر بێت و نیعمەتی بۆن بژمێرین ناتوانین، کە بەس بە لووت ئەتوانین دەیان هەزار بۆن لەیەك جیابکەینەوە.

[1] - سورەتی الانعام ئایەتی (١٥١).





﴿وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا﴾[1]. واتە: لەهەرچی شتێك داواتان کردبێت و پێوستتان بێت، پێی بەخشیوون، خۆ ئەگەر نازو نیعمەت و بەخششەکانی خوابژمێرن، ناتوانن بیانژمێرن (بەڵکو یەك نیعمەت ناژمێردرێت، ئەوەندە لق و پۆپی لێ دەبێتەوە).

بۆیە خوای گەورە باشترین بەرنامەی بۆ مرۆڤەکان ناردووە کە ئیسلامە، تاکو خۆشی خۆیان تێدابیبیننەوە، کەمایەی ڕەحمەت و بەختەوەری مرۆڤەکانە لە دونیا و دوارۆژ.

ئەم بەرنامەیە گشت شتێکی چاك و خراپی بۆ مرۆڤەکان ڕوونکردۆتەوە لەبچوکترین شت ڕێنمایی داوە، ئەو شتە خراپە ئەنجامی نەدەن، ئەوە سوودی هەیە بیکەن، نەکەن ئەم کارە بکەن چونکە مایەی خراپ بوونی کۆمەڵگایە، نەکەن غەدر لەیەتیم بکەن مافی بخۆن، نەکەن زوڵم لەیەکتری بکەن، هاوکاری یەکتر بکەن لەنەبوونی، درۆ و دزی نەکەن، دەستدرێژی بۆ سەر ناموسی یەکتری نەکەن، هەرچی چاکەیەك بوونی هەیە هەمووی لەبەرنامەی ئیسلامدایە، هەر شتێکیش خراپە بۆ مرۆڤەکان زیانی هەیە گشتی قەدەغە و یاساغ کردوون.

﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾[2]. واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم هەرچی گوناهو خراپەیە حەرامی کردووە چ ئەوانەی ئاشکران، چ ئەوانەی پەنهانن، هەروەها هەموو گوناهو داخوازی و دەستدرێژیەکی بەناحەقی حەرام کردووە، شتێك بکەن بەشەریك و هاوەڵ بۆ خوا کە هیچ دەسەڵاتی پێنەداوە، هەروەها حەرامی کردووە لە خۆتانەوە بەناوی خواوە، دوور لە هەموو زانیاری و زانستێك شت بڵێن.

---

[1] - سورەتی ابراهیم ئایەتی (٣٤).

[2] - سورەتی الاعراف ئایەتی (٣٣).





بەڵام بەداخەوە مرۆڤەکان بەئاگا نایەنەوە هەر بەدوای بەرنامەو یاسای دەستکردو حەزو ئارەزووی بەندەکان دەکەون، زۆر سپڵەو بێ وەفایە بەرامبەر بەچاکە و نیعمەتەکانی خودای گەورە.

﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾[1]. واتە: بەڕاستی زۆربەی ئینسانەکان زۆر ستەمکارو خوانەناس و سپڵەن.

بۆیە گشت بەرنامەکانی تری دونیا هەموو نەزۆکن لە هێنانەدی ژیانێکی خۆش و ئاسودەی بۆ مرۆڤەکان، بڕۆ سەیری ڕۆژئاوای بەناو پێشکەوتن بکەن چۆن مافی مرۆڤ یاری و گەمەی پێدەکرێ، غەدر لە ڕەش پێستەکان دەکرێ، مافی هەژارەکان دەخورێ، ڕێزی پیرەکان ناگیرێ، هەموویان وەك ئاژەل و حەیوانات دەژین، ڕەحم بەمنداڵ ناکرێ دەست درێژی سێکسی بۆسەر کچانی منداڵ ڕوو لەهەڵکشانە! بۆچی؟ چونکە ئیسلام بەرنامەیان نیە و خۆیان بەرنامەو یاسا بە ئارەزووی نەفسی خۆیان بۆ خەڵکی دادەڕێژن دەیکەنە یاسای وەڵات و کاری پێدەکەن.

بەڵێ ئەو یاساو ڕێسایانە کەدایان ڕشتووە، پڕبەتی لە نادادپەروەری و هەرشتێك کە حەزو و ئارەزوویان لێبوو دەیکەنە بەرنامە تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆشی نەفسی خۆیان، بۆ خۆشی و ڕابواردنی نەفسی ناپوختیان هەموو شتێك دەکەن، گوێ نادەن بەخەڵکی چۆن ژیان تێدەپەڕێنن بەخۆشی یان ناخۆشی و نەبوونی، گرنگ ئەوەیە لایان خۆیان لە خۆشترین ژیان بن.

بەڵام بەرنامەی خوای گەورە کە ئیسلامە جیاوازە لەگشت بەرنامەکانی تر کە تاکە شەریعەت و یاسای خوای گەورەیە، خۆشترین ژیان بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەردەکەن، بەبێ جیاوازی ڕەش و سپی، جوان و ناشرین، عەرەب و عەجەم، هەموو خەڵکی بەبێ جیاوازی وەك یەك سەیردەکرێن.

[1] - سورەتی ابراهیم ئایەتی (٣٤).





ئەمە (بیلالی حەبەشیە) (ڕەزای خوای لێبێت) کۆیلەبوو لەسەردەمی نەزانین و جاهیلی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرا، کە موسوڵمان دەبێ پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەیکاتە بانگبێژی موسوڵمانان بەبێ ئەوەی جیاوازی بکات لەنێو هاوەڵان، گەر لە منداڵێك بپرسی (بیلالی حەبەشی) کێیە دەیناسێ ؟

دەڵێ: بەڵێ لەسەردەمی نەفامی کۆیلە بوو لەپاشان بو بە بانگدەری ئیسلام، ناوبانگی هەر بە بەرزی ماوەتەوە لەپاش هەزاران ساڵ، سەیربکە زۆربەی وڵاتە موسوڵمانەکان ناوی منداڵیان ناوە (بیلال) و شانازی پێوە دەکەن.

بەڵێ ئیسلام ڕەحمەتە بۆ مرۆڤایەتی چەترێکە جێگای گشت کەسێك لەژێر سێبەری دەبێتەوە، ئەگەر سەیری هاوەڵان بکەی دەبینی هەریەکەو لەوڵاتێکەوە هاتووە ناوبازنەی ئیسلام، (گاوانی کوردی، سوهەیبی ڕۆمی، سەلمانی فارسی، بیلالی حەبەشی) (ڕەزای خودایان لێبێت) هەریەکەو لە وڵاتێکەوە هاتبوون ئیسلامیان هەڵبژارد بوونە موسوڵمان، بەبێ ئەوەی ئیسلام جیاوازی بکات لە نێوانیان، پلەو پایەی بەرزیان هەبوو لە دەوڵەتی ئیسلام، گیان و ڕابواردن و خۆشیەکانی خۆیان کردە قوربانی لە پێناو خودا بەخشیان تا ئیسلام سەر بەرزبکەن، تاکو مرۆڤایەتی گشتی بێنە نێو ئەو ڕەحمەت و خۆشیەی لەبەرنامەی ئیسلامدا هەیە، بۆیە هەتا ئێستاش موسوڵمانان بەبیستنی ناویان دڵخۆش دەبن.

بەڵێ بەڵام مرۆڤەکان زۆربەیان گومڕابوونە هاتوون بەبێ ئەقڵی دژایەتی خودای گەورە دەکەن بەرنامە و یاسا دادەڕێژن دژی بەرنامەی خوا، ئەمە بێوەفایی و سپڵەی نیە تۆی مرۆڤێکی دروستکراو لە نوتفەیە لەدڵۆپەیەك.

﴿أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ﴾[1]. واتە: ئایا کاتی خۆی نوتفەیەك نەبووە لەمەنی کە دەرژێنرایە شوێنی خۆی کە منداڵانی دایکە.

[1] - سورەتی القیامة ئایەتی (٣٧).

بەڵێ تۆی لاواز بێیت و دژایەتی دروستکەری گشت دروستکراوەکان بکەیت ئەمە گومڕایی نیە؟، لەکاتێکدا دەتوانێ گشت نیعمەتەکانی بگرێتەوە ئایە تۆی مرۆڤی بێ دەسەڵات چیت پێدەکرێ؟، ئەوە خودای گەورە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ)دەفەرمووێ: بەکافرو بێ بڕواکان بڵێ: ئەگەر لەسەر زەوی ڕۆژ نەمێنی واتە تەنها شەوی تاریك بێ کێ هەیە ڕۆژی ڕووناکتان بۆ بێنێتەوە؟ تاکو کارەکانتان لە ڕۆژ ڕاپەڕێنن و شەو بحەسێنەوە. ﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾[1]. واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: خەڵکینە هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا شەوگار بکات بەهەمیشەیی تا ڕۆژی قیامەت (هەر ڕۆژ نەبێتەوە) چ خوایەکی تر هەیە جگە لە الله بتوانێت ڕوناکیتان بۆ فەراهەم بهێنێت، ئایە ئێوە ئەم ڕاستیانە نابیسن؟

کەوابوو تۆی مرۆڤ کەخۆت دروست کراوی خوای گەورەیت، بۆچی هەتا کەی دژایەتی بەرنامەی خودا دەکەی؟ بەدوا کەوتووی دەزانی دەڵێی بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێ، چونکە دونیا هی ئێوەنیە بەیانی بەجێی دێڵن، بۆچی بەئاگا نایەیتەوە سەیری زاڵم و خراپەکارانی پێش خۆتان کردووە چیان بەسەرهات؟ لەکاتێکدا خۆیان کردبوو بەخودا پەنا بەخوای گەورە هێزو دەسەڵاتی زۆریان هەبوو هەموویان بەکار هێنا بۆ دژایەتی بەرنامەی خودای گەورە بەڵام گشتی تەفروتونا بوو لەناو چوون.

﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾[2]. واتە: ئایا بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چیمان بەسەر ئەو نەتەوانەی پێش ئەماندا هێناوە، لەمان زۆر بەهێزترو بە دەسەڵات تر بوون.

---

[1] - سورەتی القصص ئایەتی (٧١).

[2] - سورەتی الروم ئایەتی (٩).





دەبیر بکەوە بزانە ئەمە (فیرعەون، قارون، ئەبو جەهل، ئەبولەهەب) ..هتد گشتیان لەناو چوون بەخۆیان و هێزودەسەلات و بەرنامە پوچ و نارەواکەیان بۆهەتایە چوونە زبڵدانی مێژووی ڕەش و بوونیان نەما، چونکە دژایەتی بەرنامەی خوای گەورەیان دەکرد. بۆیە ئەی بەندەکانی خوا ڕەحمەتی خواتان لێبێت باهەموومان بە ملکەچی بگەڕێینەوە بۆ ئیسلام و دەستی پێوە بگرین کەمایەی سەرفرازی هەردوو دونیایە، خۆمان تەسلیمی خودای بەرزو مەزن بکەین.

﴿وَأَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾[1]. واتە: هەوڵ بدەن هەمیشە و بەردەوام دڵتان لای خوابێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن، پێش ئەوەی کە سزای خوا یەخەتان بگرێت لەوەو دوواش سەرکەوتوو نابن و کەس نابێت بەرگریتان لێ بکات.

بۆیە سەرکەوتن و پاشەڕۆژ هەر بۆ ئیسلامە باهەر دژایەتی بکرێت بەهەر جۆرە ڕێگە و شێوازێك بێت، لە کۆتاییدا هەر دینی خوای گەورە سەردەکەوێت بەسەر گشت بەرنامە دەستکردەکانی مرۆڤ، ئەم ئیسلامە دەگاتە گشت شوێنێك کە شەو و ڕۆژی بگاتێ، ئەمەش موژدەی پێغەمبەری خۆشەویستمانە ﴿ﷺ﴾ بۆ موسوڵمانان کەدەفەرمووێت: (لَيَبْلُغن هذا الأمر ما بلغ اللَّيل والنَّهار، ولا يترك الله بيت مَدَرٍ ولا وَبَرٍ إلَّا أدخله اللهُ هذا الدِّين)[2] واتە: ئەم ئیسلامە دەگاتە ئەو جێگایەی کە شەو وڕۆژی پێ گەیشتبێ، هیچ ماڵێك بەجێ ناهێڵێ چ لە قوڕ دروست کرابێ یان لە خێوەت واتە: لە موو و خوری دروست کرابێ ئەم ئایینەی تێ دەچێ.

کەوابوو بێگومان بن ئەی بەندەکانی خودا دڵنیابن و یەقینتان هەبێت سەرکەوتن هەر بۆ ئیسلامە ئەگەر لەنێو ئیماندارانیش پیاو نەمێنێ بەرگری لەدینی خودای گەورە بکات،

---

[1] - سورەتی الزمر ئایەتی (٥٤).

[2] - (رواه أحمد في مسنده، ژمارەی فەرموودە: ١٦٩٥٧).





بێگومان ئەوە خوای گەورە شکۆمەندی و ڕێز و پایە بڵندی هەر دەگێڕێتەوە بۆ ئەم ئیسلامە، زەوی دەبێتە موڵکی بەندە ڕاستگۆکانی خودا، حوکم و دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام ئەمە پەیمان و بەڵێنی خودای کارزانە.

﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾[1]. واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە لە کتێبی زەبووردا دوای تەورات بڕیارمان داوە کە: بێگومان بەندە شیاو و چاکەکانم دەبنە خاوەنی زەوی.

بۆیە خوای گەورە هەر ڕێساو شەریعەتەکەی خۆی کە ئیسلامە سەردەخات بەسەر گشت بەرنامە دەستکردەکانی دەستی مرۆڤ و ژەنگ و ژاری کوفرو بێبڕوای و گشت یاساو بەرنامەکان ڕا دەماڵێت و، تەنها شکۆ و عیززەتی ئیسلام دەمێنێتەوە بەسەر بەرزی ئەگەر چی مونافیق و دووژمنانی دینەکەی خواش پێان ناخۆش بێت.

﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾[2]. واتە: عیززەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی خوا پاشان پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە.

بۆیە دەڵێین بەڵێ ئیسلام تاکە بەرنامەیە کە مایەی خۆشی و ئاسوودەیی ژیانە، بۆ گشت بوونەوەر لە هەموو کون و قوژبنێکی ئەرز و ئاسمان، هەموو مافی خۆیان هەیە بەبێ زووڵم کردن لە بچوکترین شت.

کەوایە ئەی بەندەی خودا دڵخۆشبە کەتۆ موسوڵمانی و ئیسلام بەرنامەتە، کە پابەندبوونی مرۆڤ پێیەوە مایەی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهەشتی پان و بەرین بێ چۆن بۆی نەمرین و نەژین؟! کەوابو با هەموومان بەتوندی دەستی پێوە بگرین کە باو بۆڕانی هیچ گەردەلولێکی ڕەش نەتوانێ ڕەگ و ڕیشالی لە دڵمان هەڵبکەنێت، بەئیزنی الله تعالی.

---

[1] - سورەتی الانبیاء ئایەتی (١٠٥).

[2] - سورەتی المنافیقون ئایەتی (٨).





# بەخشین لە پێناو خوای گەورەدا

یەکێك لەکردەوە هەرە جوانەکانی ئیسلام بریتییە لە بەخشین بە هەژار و نەدارەکان لەو سەروەت و سامانەی کە مرۆڤەکان بەدەستی دێنن لە ژیانی ڕۆژانەیان، دەبێ ئێمەی موسوڵمان ئەو ڕاستییە بزانین کە ژیانی دونیا لە ئاستێك دا مانەوەی بۆ نیە کە مرۆڤەکان بەردەوام لەیەك ئاستی خۆشی یان ناخۆشی یان دەوڵەمەندی یا هەژاری بمێننەوە، بەڵکو گۆڕانکاری بەسەر ژیانی سەرجەم مرۆڤەکان دێت بە تێپەڕبوونی کات، کەسی وایە دینارێکی نیە بەڵام ڕۆژگار بەسەر دەچێ دەبێتە ملیۆنێر و نازانێ هەژاری و نەبوونی چییە.

لە سەردەمێکدا دەژین دڵ ڕەقبوونی مرۆڤەکان گەیشتۆتە ئاستێکی زۆر بەرز خەڵك تەنها بۆ نەفسی خۆی ئەژیت، غەمی هیچ موسوڵمانێکی تری نیە کە چۆن ژیان بەئازار و ناخۆشی و نەبوونی بەڕێ دەکات، کە خۆی خواردنی خۆش بوو، جلوبەرگی جوانی هەبوو، خانووی بەرزی هەبوو، لەخۆشگوزەرانی بوو هیچ گوێ بە موسوڵمان نادات چی دەخوات چی لەبەر دەکات لە چی خانوویەك ژیان بەسەر دەبات، کەچی دڵی نایەت دینارێك لە پێناو خودای گەورە ببەخشێ بە دەست کورتێك غەم و ئازاری یەتیمێك کەم بکاتەوە.

ئەم ڕۆژگارەی ئێستا بۆ مرۆڤەکان بۆتە قیامەتێکی زۆر سەخت و دژوار هەموو خەڵکی غەمی خۆیەتی، کەخۆی ژیانی خۆشبوو گوێ ناداتە کەس کەچۆن ژیان بەڕێ دەکات، بێ ئاگایە لەوەی ئێستا کەسانێك هەن نان و ئاوێك نیە سکی ماڵ و منداڵیان پێ تێربکەن!، ژەمێکی خواردنی خۆش نیە بیخۆن، جلو بەرگێکی چاك و جوان نیە سەرمای زستان و گەرمای هاوینی پێ بەڕێ بکەن، پیاویان نەماوە غەم و ئازاریان لەسەر کەم بکاتەوە، ئێوارە لەکاتی هاتنەوەی لەکار عەلاگەی خواردنیان بۆ بهێنێتەوە، وەك هەموو خەڵکی بەخۆشی ژیان بەڕێبکەن.




بەڵێ نازانێ ماڵانێك بێ نازکەوتوون فرمێسکی چاویان بۆتە خوێن و دڵیان بڵێسەی ئاگری گرتووە، لە غەم و میحنەت و ناخۆشی و هەژاری، بۆیە کە ئێمە موسوڵمانین دەبێ غەمی برا و خوشکانی ئیماندار بەغەمی خۆمان بزانین، باهەوڵدەین دڵیان خۆشبکەین هەست بەبێ کەسی و نەبوونی نەکەن ئەگەر بەکەمترین شتێکیش بێ، ئەگەر لە نەبوونی تەنها بەدەست بەسەر داهێنانی منداڵەکانیانیش بێ با دڵیان خۆشبکەین، بۆیە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێت: (أفضلُ الأعمالِ أنْ تدخُل على أخيك سروراً أو تقضي عَنْهُ دَيْناً أو تُطْعِمهُ خُبزاً)[1]. واتە: چاکترین کردەوە ئەوەیە کە خۆشی و شادییەك بخەیتە ناو دڵی برایەکتەوە، یان قەرزێکی بۆ بدەیتەوە، یان خواردنی پێ بدەیت ئەگەر بە لەتە نانێکیش بێت.

بەڵێ موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە لەغەمی دەست کورتی و نەبوونی هەژارە ئیماندارەکان جەرگ و دڵی بۆیان ژان دەکات، هەموو هەوڵێك ئەدات بۆئەوەی کەمێك غەم و ناسۆرەکانیان لەسەر سوك بکات، کاتێکی باسی نەبوونی موسوڵمانێکی بۆ دەکەن بەدەست هەژاری، یان کەباسی بێوەژنێکی ئیمانداری بۆ دەکەن چەندین منداڵی یەتیمی هەیە بێ کەس و خاوەن، ئەوکاتە دڵی خوێنی لێدەچۆڕێ لاشەی هەموو ژان دەکات لەغەمیان، ئەمە نمونەی موسوڵمانی ڕاستگۆی شوێنکەوتەی ئیسلامە.

عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﴿ﷺ﴾ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾ : (مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى)[2]. واتە: (نعمان کوڕی بشیر) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: نمونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی بۆ یەکتر و، هاوسۆزی و بەزەیی یەکدا وەکو یەك جەستەوان، ئەگەر ئەندامێکی ئازارێکی هەبوو ئەوا دەناڵێنێ لە تاو بێخەوی و گەرمە تا.

---

[1] - (صحيح الجامع: ١٠٩٦، سلسلة الأحاديث الصحيحة: ١٤٩٤).

[2] - ( رواه البخاري، ژمارەی فەرموودە: (٥٦٦٥).





بۆیە موسوڵمان دەبێ غەمی هەژاری و نەبوونی برا و خوشکە ئیماندارەکانی بێت هەست بە ئازار و غەمەکانیان بکات، ببێتە باوك بۆیان ئەمەش هەمووی بە باشترین ئەجرو پاداشت بۆی ئەنوسرێ لای خودای گەورە کە هاوکاری هەژار و یەتیم و بێوەژنەکانی کردووە، غەمی ئەوانی بەغەمی خۆی داناوە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، وَكَالْقَائِمِ لَا يَفْتُرُ، وَكَالصَّائِمِ لَا يُفْطِرُ)[1]. واتە: (ئەبو هریرە) (ڕەزای خودای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە یارمەتی بێوەژن و هەژار دەدات، وەك ئەو کەسە وایە، کە لەپێناو خوادا جیهاد دەکات، هەروەها وەك ئەو کەسە وایە کە بەردەوام خەریکی شەو نوێژ بێت و بێزارنەبێت لێی، هەروەها وەك ئەو کەسەش وایە کە بەردەوام بە ڕۆژوو بێت و نەی شکێنێت.

ئەوەش بزانە بەهاوکاری کردنی ئەو کەسانە و یارمەتیدانیان لەکاتی نەبوونیان دەبیت بەخاوەنی ئەم موژدەیەی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) کە فەرموویەتی: (أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شَيْئًا)[2]. واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: من و ئەو کەسەی منداڵی بێ باوك بەخێو دەکات، لە بەهەشتدا بە ئەندازەی نزیکی پەنجەی شەهادە و پەنجەی ناوەڕاست لە یەکتر نزیکین.

بەڵام لەم ڕۆژگارە زۆرێك لەوانەی خودای گەورە لەماڵی دونیای پێداون ڕەزیلی دەکەن لە بەخشین بە هەژارەکان، دڵیان نایەت دینارێك بدەن بە مناڵێکی یەتیم کەچی خۆشترین ژیانیان هەیە، گیرفانیان پڕی پارەیە چەندین شوقەو خانوویان هەیە بەکرێیان داوە، چەندین دۆنم زەویان هەیە، و چەندین سەیارەیەیان هەیە هەر منداڵێکی خۆی جۆرە مودیلێکی لایە،

---

[1] - (صحيح البخاري، ژمارەی فەرموودە: (٥٠٣٨).

[2] - (صحيح البخاري، ژمارەی فەرموودە: ( ٦٠٠٥).

باوکەکەیان هەموو ساڵێك مۆدێلی سەیارەی دەگۆڕێت و نازانێت چی لەپارەکەی بکات؟، بۆ یەك هەفتە جلێکی گرانبەها دەکڕێ دواتر فرێی ئەدا، بۆیە ئەم جۆرە کەسانە با لە ئیمانیان بترسن چونکی موسوڵمانی ڕاستەقینە کەسێکە خۆشەویسترین شتێکی دونیایی لە لای بەنرخ بێت لە پێناو خودای گەورە دەیبەخشێت.﴿ لَن تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُوا مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾[1]. واتە: ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکی و چاکەکاری هەتا لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت نەبەخشن، هەر شتێکیش ببەخشن ئەوە خوا ئاگاو زانایە پێی لێی ون نابێت و بێ پاداشت نابێت.

بۆیە ساردمەبنەوە لەیارمەتیدانی هەژاران ئەگەر بە شتێکی کەمیش بێت، ئەوەی تۆ دەیبەخشی بە یەتیمەکان ئەوە قەرزە بەخودای گەورە ئەدەی لە دواڕۆژدا قەرزەکەت دەیان جار باشتر پێ ئەدرێتەوە خێرو یارمەتی پاداشتی ( ١ بە ٧٠٠)ە لای خودای گەورە، هەروەك خودای بەدەسەڵات نمونەیەك دەهێنێتەوە بۆ ئەو کەسانەی ماڵ دەبەخشن لە پێناوی و مەبەستیان ڕەزامەندی ئەوە، دەفەرمووێت: ﴿مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ﴾[2]. واتە: نمونەی ئەو کەسانەی کە ماڵی خۆیان دەبەخشن لە پێناو خوای گەورەدا وەکو دەنکە گەنمێك وایە کە حەوت گوڵ بکات وهەر گوڵەی سەد دەنکی تێدا بێت، (واتە پاداشتی خێر وچاکە یەك بە حەوت سەدە)، وە خوای گەورە ویستی لێ بێت بۆهەرکەسێك لەوەیش زیاتر پاداشتی دەداتەوە.

هیچ کاتێك وامەزانە ئەو شتەی کەدەی بەخشی بەهەژار و یەتیمەکان کەمە، نەکەی وات لێ بکات سارد بیەوە لەوەی بی بەخشی، ئەوەش بزانن پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (اعْلَمُوا أَنَّ أَحَبَّ الْعَمَلِ إِلَى اللهِ أَدْوَمُهُ وَإِنْ قَلَّ )[3]. واتە: بیشزانن خۆشەویست ترین کردار لای خودای گەورە بەردەوام ترینیانە باکەمیش بێت.

---

[1] - سورەتی ال عمران ئایەتی (٩٢).

[2] - سورەتی البقرة ئایەتی (٢٦١).

[3] - (صحیح مسلم، ژمارەی فەرموودە: (٧٨٢).





لەبەر ئەوە هەر کاتێك کارێکی باش دەکەین پێویستە سەیری بچوکی کارەکە نەکەین دڵنیابن لەوەی خوای گەورە زۆر بە گەورەی تەماشای کارەکەتان دەکات و پاداشتان دەداتەوە لەسەری ئەگەر بەدڵسۆزی و نیەت پاکی و ڕاستگۆیانە بۆ خودای بەرز و مەزن ئەنجامی بدەین.

بۆیە کەخودای گەورە ماڵی دونیای پێداوی و نیعمەتی زۆری بەسەر ڕشتوی هەمیشە دەست پێشخەری بکەن لە یارمەتیدانی هەژار و یەتیمەکان ئەگەر کەمیش بێ لای خوای گەورە ون نابێت ئەگەر بەنیەتێکی دڵسۆز بۆخوای گەورەت بێ ئەوە دەبێتە مایەی ڕزگاربونت لە ئاگری دۆزەخ (إجْعلوا بَينكُم وبَينَ النارِ حِجاباً وَلَو بِشِقِّ التَمرةِ)[1].

واتە: بەربەستێك لەنێوان خۆتان وئاگردا دابنێن، یان دروست بکەن بۆ ئەوەی لەچنگی قوتاربن ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت.

لەم ئامۆژگاریەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ موسوڵمان ئەوەیە ببەخشن بەردەوام ئەگەر بەلەتە خورمایەکیش بێت بۆ ئەوی ببێتە بەربەست لە ڕزگاربونت لە ئاگری دۆزەخ، بۆیە کە تەرازووی دوارۆژ کەمتر لە مسقاڵە زەرەیەك دەخوێنێتەوە،﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ﴾[2]. واتە: جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی مسقاڵە زەرەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە.

مادەم لەو ڕۆژەدا پێویستمان بەکەمتر لەلەتێك خورمایە، مادەم بەربەستە لەنێوان خۆمان و ئاگری پڕ ئێشی دۆزەخدا، دەبا پەلە بکەین ئەی بەندەکانی خودا لەچنگی ئاگری سەخت و دژواری دۆزەح خۆمان ڕزگار بکەین بە بەخشین و خەم خۆری لە یەتیمەکان، تا نەمردووین فرستە بۆمان کۆشش و ماندووبون بکەین بۆ ئەنجامدانی کاری چاك و ڕازی کردنی خودای گەورە تا بگەینە ئەو بەهەشتەی کە بۆ چاکەکاران ئامادەکراوە.

[1] - (سلسلة الأحاديث الصحيحة: ٨٩٧، وصحيح الجامع الصغير: ١٥٣).

[2] - سورەتی الزلزلة ئایەتی (٧).





# ئازارەکانی خۆشەویستی

گەنجەکانی ئەم سەردەمە زۆرێکیان ڕێگای خۆشەویستی دەگرنە بەر بۆ بەدەست هێنانی دڵی کچەکان، واخۆیان پیشان دەدەن زۆر خۆشیان دەوێن، بەقسەی بریقەدار سەرەنجامی زۆرێك لەکچانیان وێران کرد، زۆرێکیان تووشی نەخۆشی دەروونی کرد، شەرەف و ئابڕوی زۆرێکشیان لەبەر چاوی خەڵکی سوککرد، بەشێکیانیش بەکوشتن و لەناوبردن دا.

گەنجەکان زۆرینەی ڕێگا بەکاری دێنن بەتەلەفۆن و چاتەکانە، لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو ئەنتەرنێت، فەیسبوك، واتس ئەپ، ڤایبەر، مرۆڤەکان بەگشتی لە ئێستادا ئالودەی بەکارهێنانی بوون بەگەورە و بچوکەوە، کەڕێگا خۆشکەرن بۆ پەیوەندی کردنی مرۆڤەکان بەیەکەوە، لەهەمان کاتدا خراپ بەکارهێنانیان مرۆڤ تووشی سەدان کێشەو نەهامەتی دەکات تا لەکۆتای دەگاتە ئاستی لەناو چوون.

زۆر بوونی کەناڵەکانی ئاسمانی و پەخشکردنی زۆری فیلمەکان، کەتایبەتن بەخۆشەویستی درۆینە و بەداڕوخانی ئەخلاق و ڕەوشتی کۆمەڵگا، ئەو فیلمانە لەسەر خۆشەویستیەك دەڕوات تایبەتە بە سێکس بازی و تێرکردنی نەفس، تاوەکو کوڕان و کچانمان چاویان لێبکەن، ڕۆژێك لەدەوامەکەی بەئەنقەست بەتەنیشتی دەڕوات خۆی لێدەدات، دواتر چاك و چۆنی وەرگرتنی ژمارەی تەلەفۆن، لەپاشان قسەو پیاسەکردن بۆ پارك دەست لە مل کردن، پەنا بەخوا تا دەگاتە ئاستی تاوانی گەورە.

بەڵێ ئەم فلیمە پەروەردەیەك فێری گەنجانمان دەکات کەهەمووی سەرتاپای و خیانەتە، هاوڕێ ژنی هاوڕێکەی خۆش دەوێت، یان دایکی یان خوشکی هاوڕێکەی خۆش دەوێت، پەنا بەخودای گەورە، بەم شێوەیە هەموویان خەریکی ناپاکی و نێچری خۆیانن، خەریکی دەست بازی و عارەق خواردن و سەماکردنن بەتێکەڵی، ئەمەیە ئەو خۆشەویستە حەرامەی بانگەوازی بۆ دەکەن و بلاوی دەکەنەوە.

ئەمە هەموو فیکری رۆژئاوایە بۆ تێکدانی ڕیزی موسوڵمانان و دوورخستنەوەیان لە ئیسلام، تا حوکمی گشت جیهان دەخنە ژێر دەستی خۆیان، بۆیە پیلان دادەڕێژن بەبڵاوکردنەوەی فیلمی ڕووت و سێکس بازی و هێنانی جل و بەرگی نیمچە ڕووتن بۆ کۆمەڵگای موسوڵمانان، تاکو گەنجانمان عەقڵ و هۆشی لەدەست بدەن و بکەونە ژێر حەزو ئارەزووی نەفسیان.

بۆیە بەداخەوە بۆ باوك و دایكان كە ڕێگە ئەدەن لەماڵەوەیان فیلمی دۆبلاژكراوی دوور لە ڕەوشتی جوانی ئیسلام پەروەدەی منداڵەكانیان بكەن، چونكە ئەم كوڕ و كچە كاتێك ئەبینن ئەكتەرەكان دەستیان لەناو دەستە و پیاسە ئەكەن، لە دڵی خۆیان ئەڵێن چیمان كەمترە لەوان، بۆیە هەوڵ ئەدەن چاویان لێبكەن، شـــەوان بەخەیاڵی ئەوان دەخەون، بۆیە بەیانی لە قوتابخانە و زانكۆ كچەكەت لەســـەر ڕێگا گەر كوڕێكی سەرسەری داوای خۆشەویستی لێكرد ژمارەی خۆی پێدا، یەكسەر زوو باوەڕی پێدەكا و هەڵدەخەڵەتێ، لە ئەنجامدا خۆتان و كچتان دەبنە قوربانی.

بەڵێ ئەمە ئەو خۆشەویستەیە كە بێ باوڕان دەیانەوێت ڕۆڵەی خوێن شیرینی موسوڵمان فێری بن، تاكو بەیانی دایك و خوشكی و خێزانی بینی دەستی لەناو دەستی كەسی بێگانەبوو هیچ دەنگ نەكات.

ئەمەش نموونەی كچێك كە لە فیلم و تیڤیەوە فێری خۆشەویستی هەڵخەڵەتاندن بوو، ئەو كچە بەستەزمانە پەیوەندی نێوان كوڕ وكچی لەڕێی كەناڵە ئاسمانیەكانەوە زانی، بۆیە هەر كاتێك ماڵەوەی دەنوستن ئەو هەڵدەستا بۆ تەماشاكردنی ئەوەی كەخوا حەرامی كردوو لەدیمەنی ڕووتی وبەڕەڵایی لەبەرنامەی كەناڵی بێ ئابڕووەكانەوە، كە ئارەزوەكان دەوروژێنێ بەتێبەڕبوونی كات كچە خۆی پێ ڕانەگیرا، ئەوە بوو خۆشەویستێكی پەیداكرد بۆ دەرخستنی ئەوەی كەلەناخیدا هەیە، بۆیە ویستی بچێتە ئەم تاقی كردنەوەیەوە ڕۆژێكیان گەنجێكی ناسی لەڕەگەزی گورگ و لەپێستی مرۆڤدا كەبەزەیی نازانێ ئەمەش پارونێكی چەور بوو بۆئەو، لەم ڕۆژگارەی خۆشماندا لەم كەسانە زۆرن، ئەم كچە بەستەزمانە دەبێ چی لێ بەسەربێ؟!





بێگومان ئەوەی ڕوویدا لەدەست دانی کچێنی و سک پڕبوون بەمنداڵێک دوای چیرۆکێکی دوورودرێژی پڕ ئازار؟! پاش ئەوەی دەست گیر دەکرێت لەلایەن پیاوانی ئاسایشەوە ناردیان بە دوای باوکی کچەکەدابۆ ئەوەی کارەساتی کچەکەی بەچاوی خۆی ببینێ؟! باوک ڕاوەستا لەبەردەم کچەکەیدا هیوای دەخواست بمردایە پێش بینینی ئەم کارەساتە هاواری کرد لەبەردەم هەموو پیاوانی ئاسایش دا وازم لێ بێنن بابیکوژم ؟! ئابڕوی بردین، شەرەف و ناموسی بۆ نەهێشتین ڕووی ڕەش کردین لەبەردەم خەڵکیدا؟! لەم کاتەدا کچەکە سەری بەرزکردنەوە گوتی: باوکە تۆ هۆکار بوویت بۆ ڕوودانی ئەمە، سەتەلایتێکت هێناوەتەوە ماڵەوە بێ ئەوەی چاودێری بکەیت وەک ئەوەی کەبێ ئەخلاقیت هێنابێتەوە ماڵەکە بێ ئەوەی هەستی پێ بکەیت ئێستاش دەگریت بەسەر من وکچێتی و پاکێتی مندا.[1]

ئەمەیە نەهامەتی فیلمە دۆبلاژکراوەکان کە تەبایی و خۆشەویستی خێزانی موسوڵمان تێکدەدات، ناموس و ڕەوشت دادەڕوخێنێ بۆ ئاستی ژێر سفر، وادەزانن ئەوەی لە فیلمەکە بەدیار دەکەوێ ڕاستە لەخۆشەویستی دەربڕین بۆیەکتر، نازانن هەموو درۆیە و تەنها بۆ داڕوخانی گەنجەکانمانە.

بۆیە خۆشەویستی دوای زەواج دەست پێدەکات، لە ئیسلامدا خۆشەویستی ڕێگەی پێدراوە بەمەرجێك بەپێی شەرع بێت و سنوری خوا نەبەزێنرێ، خۆشەویستیەکە بۆ زەواج بێت چونکە چارەسەری خۆشەویستی راستەقینە تەنیا مارە بڕینە، هەروەك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ: (لم یر للمتحابین مثل النکاح)[2]. واتە: هیچ شتێك باشتر نابینم لەمارەبڕین بۆ ئەوانەی کە یەکتریان خۆشدەوێ.

[1] - (کتێبی قوربانیەکانی خۆشەویستی، لا ١١٥).

[2] - (رواه ابن ماجه رقم الحدیث: ( ١٨٤٧ ).




واتە ئەوانەی یەکترییان خۆشدەوێ بۆئەوەی توشی کاری خراپ و کێشە نەبن باشترین شت بۆئەوان زەواجە، نابێ کەیەکتریان خۆشدەوێ پێش مارەیی بەتەنها بەیەکەوە بن تاکو تووشی تاوان نەبن و هەرچی زوو مارە بکرێن لەیەکتر.

کەمارەکران ئەوکات دەبنە حەڵاڵی یەکتر بۆیە واباشە باوك و دایکان کە زانیان کوڕ و کچە بەیەکتر ڕازین و یەکتریان خۆشدەوێ بارێگری نەکەن لەبەردەم بەیەك گەیشتنیان، چونکە دواتر کێشەو ئاژاوە دروست دەبێ، کوڕی واهەیە وازناهێنێ لەوکچەی ماڵەوەی ڕێگرن بۆیە هەوڵدەدات هەڵیگرێ یان هانا بۆکاری نەشیاو دەبات.

وەخۆشەویستی دوای مارە برین دەست پێدەکات بەچاکەکردن و وەفا بەرامبەر یەکتری. ﴿ وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾[1]. واتە: وە خۆشەویستی و بەزەیی خستۆتە نێوانتان بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە بارگرانی ژیان هەڵگرن و درێژە بە ژیان بدەن.

خوشکی خۆم بزانە ئەوە لەئیسلامدا گرنگی بەخۆشەویستی دراوە بەڵام بۆ دوای زەواج!، ئەوەتا (ئیبراهیم) پێغەمبەر (علیە السلام) (سارا) خانی خێزانی زۆر خۆشدەویست تاکو هەشتا ساڵ لەگەڵی ژیاو منداڵی نەبوو، بەڵام لەبەر خۆشەویستی ژنی تری نەهێنا بۆ ئەوەی هەستی بریندار نەکات، تا لەکۆتای (سارا) خانی خێزانی داوای لێکرد کە (هاجرە) خان بخوازێ تاکو لەسەر داوای ئەو (هاجرە)خانی خواست.

ئەوەش پێغەمبەری خوایە(ﷺ) خۆشەویستی خۆی بۆ (عائیشە)ی خێزانی ناشارێتەوە، کاتێك (عەمری کوری عاص) لەجەنگی (ذات السلاسل) دا بەسەرکەوتوویی گەڕایەوە لێی پرسی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێ لات زۆر خۆشەویستە؟ گومانی وابوو کە خۆی بێت، پێشەوامان لەبەردەم خەڵکی پێی فەرموو: (عائیشە)! (عەمر) فەرمووی: من پرسیاری پیاوانت لێدەکەم؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (باوکی عائیشە).[2]

---

[1] - سورەتی الروم ئایەتی (٢١).

[2] - صحیح ابن حبان، ژمارەی فەرموودە:(٧١٠٨).





ئائەوە خۆشـەویسـتی ڕاسـتەقینەیە کەدوای زەواجە لەبەر چاوی گشـت خەڵکی ڕایدەگەیێن کە خۆشەویستیانن، نەك ئەوانەی خۆشەویستیان لە پێناو ئارەزووبازی و حەزی ئاژەڵانەیە دەیانەوێ شـەرەفی ئافرەتی موسـوڵمان لە کەداربکەن، دەیانەوێ خۆشـەویسـتیەکەیان بەنهێنی بێت و دوور بێت لەخەڵك تەنها بۆ تێرکردنی نەفسـیان بێت، دواتر واز لەکچەکە بێنێت خۆیان بشـارنەوە. ﴿ يَسْـتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ﴾[1]. واتە: ئەوانە دەیانەوێت خیانەت و تاوانەکانیان لەخەڵکی بشارنەوە.

بۆیە ئەی خوشکی من هەر گەنجێك داوای خۆشەویستی لێکردی پێ هەڵمەخەڵەتێ، چونکە زۆربەیان گورگن و دەیانەوێ ڕاوت بکەن بۆ کات بەسەربردن و خۆشی خۆیان، ئەگەر ڕاسـتی کردبایە تۆی خۆش دەوێت بۆ زەواج دەهات وەك پیاوان لەدەرگای ماڵەوەتانی دەدا، بەباوکتی دەگوت کچەکەتانم دەوێت تاکو بیکەمە شاژنی خۆم!

بەڵام ئەو دەیەوێ بۆخۆشـی خۆی بەکارت بێنێـت، بەنوێنەرایەتی شـەیتان بتبات بۆ پیاسە و پارك و ئوتێل تاوەکو ئارەزوی چڵکنی پێت بەتاڵ بکاتەوە، پەنا بەخوای گەورە.

داوامان لە باوك و دایکانە هەر لە منداڵیەوە پەروەردەیەکی ئیسـلامیانە فێری ڕۆڵەکانیان بکەن، ترسـی خودای گەورە بخەنە دڵیان چونکە هەر منداڵێك لە بچوکیەوە چاودێری کرا لەلایەن باوك و دایکەوە، کە گەورە بوو بەرهەمی دەبێت و ژیرو سـاڵح دەبێت، کە گەورە بوون هیچ کات بیر لەکاری خراپ و شـکاندنی شـکۆی و ناموسی خەڵك و خێزانەکەیان ناکەنەوە.

بۆیە ئەی دایك و باوکی بەڕێزم هەوڵبدە ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری منداڵەکەت بکە کە چۆن پێشـەنگ و پێشـەوا بووە لە ڕەوشـت بەرزی، ژیانی هاوەڵان و پیاوچاکانی پێشـینی ئوممەتی ئیسلامیان پێ بناسێنە کەچۆن کێوێك بوونە لەڕەوشت و مەردایەتی بۆگشت جیهان دەرمان بوونە ئەگەر چاویان لێبکەن،

[1] - سورەتی النساء ئایەتی (١٠٨).





لە جوانترین ڕەوشـــت، ڕاســـتگۆی، دەســـت پاك و داوێن پاکی، خاوەن بەڵێن، نەك چیرۆك و ڕۆمانی هەڵبەســـتراوی ئەفســـانەی یۆنانی و ڕۆژئاوا کەگشـــتی پەروەردەیەکی چەپەڵ و ناڕێك و ناڕەســـەنە، تاکە ئامانج لێی شـــکانی حەیا و نەمانی شـــەرەف فێری تاکەکانی کۆمەڵگا دەکات، کەتەنها بۆ حەزو ئارەزووی نەفســـیان بژین، بکەونە دوای شەرەفی ئافرەت بەناوی خۆشەویستی.

بۆیە ئەی خوشـــکی ژیرم نەکەی بەدووای قســـەی باق و بریقی ســـۆز و عاتیفە باوەڕ بەهەموو کوڕێك بکەی کەداوای پەیوەندیت لێدەکات، زۆرمان بیستوە لەوبارەیەوە کە کچان بوونەتە قوربانی دەســـتی گورگەکان، بەڵێ بەتەنها ژیانی تۆی بەڕێز دەکەوێتە مەترسی سەرەنجامیشت تیاچوونە.

بۆیە ئەی خوشـــکی من زۆر وریای هاوڕێکانیشـــت بە، نەکەی بۆ کاری خراپ بە گوێیان بکەی، لە زانکۆ کاتێك باسی دەستگیران و خۆشـــەویستی خۆیانت بۆ دەکەن، نەکەی پێیان هەڵبخەڵتێی کەتۆ خۆشـــەویســـتت نیە، بۆیە گەر بەبێ مێرد بمێنیتەوە باشـــترە لەوەی تووشـــی ئابڕوچوون بیت بەدەســـتی گورگەکان، پاشـــە ڕۆژت بکەوێتە خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی بێ کەس و کار بمێنیتەوە، ئەمە نمونەی کچێکە کە بۆتە قوربانی هاوڕێ خراپەکانی و دواتر گشت خۆشیەکانی لەدەست ئەدات بەحەسرەت و خەمەوە دەمرێت.

پیرەژنەکەی دراوســـێمان لەبەر پەنجەرەکەوە وەســـتابوو فرمێســـکی حەســـرەت بە چـاوانیـدا هۆن هۆن دەهـاتە خوارەوە، چـاوەکـانی داخســـت بوو وە لەنـاو دڵە پڕ لەزووخاوەکەی هەناسەیەکی پڕ لە پەشیمانی حەشاردابوو. لەپەنجەرەی ماڵەکەیەوە ســـەیری ئەو ئاهەنگەی ژن گواســـتنەوەی دەکرد کە لە کۆڵانەکەیاندابوو، ئاخۆ ئەم ئاهەنگە چەند دڵگرانی کردبێت؟ پیرەژنەکە لەگەڵ ســـەیرکردنی ئەم ئاهەنگە بیرو هۆشی گەڕایەوە ســـەردەمی ڕابردووی دوور، ئاخۆ ئەم پیرەژنە لە لاویدا چەند جوان و ســـەرنج ڕاکێش بووە، لەو کاتەدا ئاواتی دەخواســـت کە ئەویش ئیســـتا خاوەنی پیاو و خێزان و ماڵ بێت، بەڵێ ئاواتی بۆ ئەمانە دەخواست.





بەڵام کاتێک بە ئاگا هاتەوە گەڕایەوە بۆ ئەو بارودۆخە تاڵەی ئێستای جارێکی تر لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی جل و بەرگی بوکێنی بوکەکەی کرد.
بیری هاتەوە کە چەند گۆڤارەکانی پەڕە پەڕە دەکرد و بەدوای ئەو جل و بەرگەدا دەگەڕا کە بەشایەنی خۆیی دەزانی، بۆیە چاوەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و فرمێسکی گەرم کەوتە خوارەوە لە گەرمیدا گۆناکانی سوتاند.
بیرەوەریەکانی گەڕایەوە بۆ رابردوو سەرلەنوێ بیری لەوە دەکردەوە کە بووە هۆی ئەو هەموو مەینەتی و خەم و خەفەتە بۆی، بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە کە بەهاربوو، باوکی و دایکی و خوشکە بچوکەکەی لە ماڵ دەرچوون بۆ بازاڕ، ئەو نەچوو لە گەڵیاندا، لەم کاتەدا زەنگێکی تەلەفۆن لێیدا، ئەویش بەپەلە هەڵی گرت..
هاوڕێکەی بوو قسەی لەگەڵ کرد کە بانگی کردبوو بۆ دەرچونێکی کورت و گەڕان بەناو بازاردا، بەبێ دوو دڵی ئەویش رازی بوو، کچەکەی هاوڕێی هات و پێکەوە ڕۆیشتن، لە رێگا کەوتنە قسەکردن، هاوڕێکەی لێی پرسی ئایا هاوڕێی کوڕت هەیە؟!!
ئەویش زۆر بەدڵ پاکی گوتی: چۆن ناپاکی بەرامبەر ئەو متمانە دەکەم کە کەس و کارم بە منیان داوە!!
هاوڕێکەی گوتی: ئەوە قسەیەکی کۆنە و نامەوێ بیبیستم، لە پڕێکدا هاوڕێکەی هەنگاوێکی بەپەلەی ناو گوتی: ئەوە کۆگایە سەیربکە، ئەها لەوێ کۆمەڵێك گەنج هەیە بابڕۆین بۆ لایان زووکە با ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەین، ناچاری کرد، کە ڕازی ببێت و بچێت بۆ لایان و ناسیاوی لەگەڵیاندا دروست کرد بە چەند سەردانێك.
تا ڕۆژێکیان پارچە کاغەزێکی هەڵگرت کە یەکێك لەو گەنجانە بۆی هەڵدا، بینی ژمارەی تەلەفۆنەکەی تێدایە، هاورێ کچەکەی پیرۆزبایی لێکرد بۆ دروست بوونی ئەم هاوڕێیەتی یە تازەیە، بەڵام بەداخەوە نەیزانی ئەم هاورێ تازەیەی چ گورگێکە، سەردان و گەڕان تەواو دەبوو هەردوو کچەکە دەگەڕانەوە ماڵەوە...
بەڵام ویژدانی ئەم زۆر ئازاری دەدا، لەو کاتەدا تەلەفۆنێکی بۆکرا... کێ بوو؟
هاورێ کچە شومەکەی بوو کە بەم شێوە کەوتنە گفتوگۆ، کچەکە: چۆنی؟




هاوڕێکەی: تا ئیستا پەیوەندیت نەکردووە بە هاوڕێ کورەکەت؟
کچەکە: نەخێر ناتوانم! بەڵام دوای چەند جار هەوڵی هاوڕێ کچەکەی خۆی دا بەدەستەوە و پەیوەندی کرد بە کوڕەکەوە بە تەلەفۆن، گفتوگۆکانیان لە سەرەتاوە کورت بوو بەڵام دووەم جار زۆرتر بوو، ئەوەبوو سێیەم جار کۆتایی هات بە دانانی مەوعیدێک لەگەڵ یەکتردا کچەکە چوو بۆ بینینی کوڕەکە لەکاتی دیاری کراودا، بەڵام خۆزگە نەدەچوو بەناموس و شەرەف و سەربەرزییەوە ڕۆیشت، بەڵام کاتێک گەڕایەوە ناموس و شەرەفی لەدەست دا، تازە چی بکات؟ چ بەکەس و کاری بڵێت؟
وە چی بە دایک و باوکی بڵێت؟ ڕۆژ و مانگ رادەبورد، پاش ماوەیەک هەستی بە جوڵەیەک کرد لەسکیدا، ئەی خوایە ئەم جوڵەیە بەرهەمی ئەو هەڵە و تاوانەیە بەرهەمی ئەو زینایە کە کردم، لەترسی ئابڕو چوون ناچار لەماڵ رایکرد، ڕۆژ و مانگ تێپەری تا کاتی منداڵ بوونی هات، چوو بۆ لای ئافرەتێکی شارەزا لە مامانی بۆ ئەوەی لە ماڵدا منداڵی بێت، چ منداڵێک؟ منداڵێک لە زینا.
لەوێش رایکردوو منداڵەکەی جێ هێشت لەوکاتەدا بڕیاریدا پەیوەندی بکات بە کوڕەکەوە کە بووە هۆی ئەم مەینەتی و بەڕەڵاییە بۆی،پەیوەندی کرد بەڵکو خۆشەویستەکەی لەو ناخۆشییە رزگاری کات و مارەی بکات !! بەڵام کوڕەکە بە پێکەنین و گاڵتە جارییەوە تەلەفۆنەکەی بەسەریدا داخست، چونکە ئەو یەکەم کچ نیە کە لە ئەو منداڵی ببێت بەرێگەی زینا، ئەی ئیتر چی بکات؟
خۆ خۆشەویستەکەی گاڵتەی پێ دەکات کەسەرەتا بەقسەی درۆ و ڕازاوە ڕازیکرد وا ئێستا پشتی لێکرد.
بۆیە بەناچاری پەنای بردە بەر سواڵ کردن، وەلەکاتی وون بوون و دیارنەمانی لەماڵی خۆیان باوکی هەواڵی وون بوونیدا، دۆزرایەوە و خرایە بەندیخانەی چاک سازییەوە لەبەندیخانە دەرچوو پاش ئەوەی تەمەنی بوو بە (٣٠) ساڵ، دەستی کرد بەکاری بەرگ دووری و بەتەنیایی مایەوە بەدرێژایی ئەم هەموو ساڵە دوای ئەوەی کەس وکاری دەستیان لێ هەڵگرت...




فرمێســـك یەك لە دوای یەك لەچاوی ئەم پیرەژنە لاوازە دەکەوتە خوارەوە، کاتێك سەیری جل و بەرگی بوکێنی بوکەکەی دەکرد، وەیادی ئەو هەموو بەڵێنانەی دەکردەوە کە خۆشەویستە درۆزنە تەڵەکە بازەکەی پێی دابوو، دونیا لەپێش چاوی دەسوڕا هەل هەلەی شایی و ئاهەنگ گێڕان و هەراو گریانی ئەم تێکەڵ بوو بوو.
دوای هاوارێکی خوێناوی کەوتە ســـەر زەوی و هاواری دەکرد و دەی گوت (بەزەیی ئەی پەروەردگار... بەزەیی ئەی پەروەردگار...بەزەیی ئەی پەروەردگار).
پاش ماوەیەک پیرەژنی هاوســـێمان مرد، نێژرا بەبێ ئەوەی چاوێک هەبێت بۆی بگری و فرمێسکی بۆ بڕێژێ، بێ بەش کرا لەو ژیانی هاوســەرییە ئارامە، بێ بەش کرا لەمنداڵ و سۆز و بەزەیی دایکایەتی، بێ بەش کرا لە ووشـەیەك کە گەورەترین ووشـەی(دایە)یە، بێ بەش کرا لە هەموو ئەم شتانە تەنها لە پێناوی بەیەك گەیشتن، بەڵێ تەنها لە پێناوی تام و چێژێکی چەند خولەکی.[1]
بەڵێ ئەی خوشـکی من ئەم بەیەك گەیشـتنەی پێش زەواجی بووە هۆی دۆڕانی گشـت خۆشـیـەکی دونیـایی بـەدرێژایی تـەمـەنی، بۆیـە نـەکـەی بـەهیچ شـێوەیەك متمـانـە بەهاوڕێکانت بکەی گەر لەدین و ئەخلاقی دڵنیانەبووی، گەرنا تووشـی ماڵوێرانی و ڤایرۆسی سـەرەتان دەبیت گشـت شـتێکیش لەژیانی دونیا لەدەسـت ئەدەی، کەوابوو باوەڕ بەو کوڕانە مەکە داوای خۆشەویستیت لێدەکەن بەقسەی بریقەدار بۆ ئەوەیانە تاکو هەڵت بخەڵەتێنن و ڕاوت بکەن بتخەنە ژێر دەسـتی خۆیان، بۆیە هەمووکات هەرشـتێك بوو لەژیانت پرس بەباوك و برا و ماڵەوەتان بکە تاکو دووربی لەهەموو ئازار و ناخۆشییەك.
پاشـــان گەر تۆ دەتەوێ ژیانێکی خۆشـــت هەبێ و پیاوێکت هەبێ بەهەموو دونیات نەدات، ئەوە خۆت بۆ خوای گەورە یەکلایی بکەرەوە بەدڵســۆزی، گشـــت فەرمانێکی جێبەجێ بکە دڵنیابە خوای گەورە زۆر بەسۆزترە وەك لەخۆمان بۆ خۆمان،

[1] - ( کتێبی قوربانیەکانی خۆشەویستی، لا ١٢٣).




بۆیە هیچ کات خەم مەخۆ ئەی خوشکی من بەوەی کەوا هاورێکانت هەموو شوویان کردووە منداڵیان هەیە، تۆ نیتەو غەم دەخۆی بەو هۆیەوە، ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەوە بزانە خوایەکمان هەیە ئاگادارە بەغەم وخەفەت و خۆشی وناخۆشی دڵمان.
﴿وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ﴾[1]. واتە: بزانن بێگومان خوا دەزانێت بەوەی کە لەدڵتان دایە.
هەر ناخۆشیەك لەژیانت کە بەقورسی دەزانی لەسەرت لابچێ، یان بەلاتەوە قورسێ ڕزقت زیاد بێ، یان نەخۆشبیت و چارەسەرت نەبێ، یان بێ هاوسەربیت و بتەوێ هاوسەرت بێ، ئەوا تەنها داوا بکە لەو خوایەی کە دەرگای بەردەوام کراوەیە بۆ گشت بەندەکانی.
﴿وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[2]. واتە: ئەگەر خوا بیەوێت تووشی خێرو خۆشیەکت بکات، ئەوە ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.
کەوایە قەت بێ هیوا مەبە لە ڕەحم وسۆزی خوای پەروەردگار دڵنیابە لەگەڵ خوا ڕاستگۆبی هەمووشتێك بەدڵی تۆ دەبێت بە ئیزنی الله تعالى.
خوای گەورە هەموومان بپارێزێ لە شەڕی نەفس و شەیتان و، پاشان سەربەرزانە لەژیانی دونیا بۆ خوای گەورە بژین و بمرین.



[1] - سورەتی البقرة ئایەتی (٢٣٥).
[2] - سورەتی الانعام ئایەتی (١٧).




# نەکەی بێ ئاگابیت لە قیامەت!

بەڕاستی کەوتووینەتە ڕۆژگارێك مرۆڤەکان بەگشتی و موسوڵمانان بەتایبەتی، قیامەت و مردن و گەڕانەوەیان بۆ لای خوای گەورە لە بیرکردووە.

زۆربەی خەڵکی خەمی ژەمە خواردنێکی خۆشە، یا پیاسەو سەفەرکردن بۆ شوێنی سیاحی و گەشتیاریەکان، یان خەمی بوون بە بەرپرس و مەسئولی وڵاتە تاوەکو بە ئارەزووی خۆی فەرمان دەربکات، یان خەمی هاوسەرگیریەتی کە ئەبینێت هاوڕێکانی هەموو خاوەن ماڵ و منداڵن، ئەمانەو دەیان و سەدان خەمی تر، بەڵام خەمی چاکە کردن و کۆشش کردنی نیە بۆ قیامەتی، هەروا دەزانن لە دونیا دەمێننەوە نامرن هەر بێفەرمانی خوای گەورە بۆتە پیشەیان لە ژیان، گەنجە بێ ئاگایە لەنوێژەکانی نازانێ بنچینەی ئیسلام چیە کەچی ناوی یاریزان و گۆرانیبێژەکانی گشتی لەبەرە.

یان کچە خۆڕازاندنەوەی بۆتە پیشەی ڕۆژانە، بۆپەیمانگا و زانکۆ و شوینە گشتیەکان هەر بەجوانی خۆی ئەنازێت، ئەی بەندەی خوا ئایە هیچ کات بیرت کردۆتەوە ڕۆژێك دەبێ بمری و زیندوو بکرێیتەوە؟، هەروەك چۆن لەسکی دایکمان بووین ئەوها ڕۆژێکمان لەپێشە دەبێ مردن بمانگەڕێنێتەوە بۆناو سکی خاك لە پاشان دەبێ زیندوو بکرێنەوە!.

﴿أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَٰلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ ﴾[1]. واتە: ئایا کاتێك مردین و بووینە خاك و خۆڵ زیندوو دەبینەوە؟! دوای مردن گەڕانەوە ئەستەمە!

[1] - سورەتی ق ئایەتی (٣).

ئەو کەسانە وادەڵێن کە لەدونیا بێ فەرمانی خودابوو بوو بە پیشەیان وایان دەزانی زیندوو نابنەوە، هەر بۆ خۆیان لە ژیانی دونیا رابوێرن دڵیان باهەر ڕەق بێت بەرامبەر فەرمان و یاسای خوا کە ئیسلامە، ئامۆژگاری وەرناگرن، کاتێك کەسێك پێیان دەڵێت: برای من خوشکی خۆم بەسە دەست هەڵگرن لەتاوان و بێفەرمانی خوای گەورە، بەڵام ئەوان گوێیان کەڕ ئەکرد و دڵەکانیان قوفڵ ئەدا لە ئاست حەق و ڕاستی، جا خوای پایەبەرز وەڵامیان دەداتەوە، دەفەرمووێت: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَابٌ حَفِيظٌ﴾[1]. واتە: نەك هەر توانای زیندوو کردنەوەی ئەوانمان هەیە بەڵکو ئەشزانین کەزەوی چەندێك لە لاشەیان ئەخوات و ئاگاداری ئەویشین، ئێمە تۆمارگەی تایبەتیمان هەیە، کەهەموو شتێکی تێدا تۆمارە و هیچ شتێک لەبارەی ئەوانەوە لە ئێمە شاراوەو بزر نیە.

بەڵێ بێگومان هەر کاروکردەوەیەك کە کردوومانە بە ئاشکراو نهێنی لەلای خوا وون نابێ، لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت دەربارەی ئەوەی بۆ سنوری خوامان دەبەزاند، بۆچی لاشەی خۆمان ئەڕازاندەوە لە خوا نەدەترساین، بۆچی چاومان لەسەیرکردنی نامەحرەم نەدەپاراست، بۆچی دژایەتی موسوڵمان و ئەهلی مزگەوت و ئیسلاممان ئەکرد، جا ئەوکاتە لەبارەگای خوای گەورە هیچ بیانوو و عوزرمان بۆ نیە تەواو کاتی حەشرو حسابە. بەڵێ خوای گەورە لەدوارۆژ بەر پرسیارنیە بەرامبەر بەندەکانی، واتە بڵێن: خوایە نەمان توانی ئەوکارە بکەین، نەماندەزانی نوێژ بکەین، نەماندەزانی قورئان بخوێنین، ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾[2]. واتە: پرسیار ناکرێت لەوەی کە خوا دەیکات، لە کاتێکدا ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت و موحاسەبە دەکرێن.

---

[1] - سورەتی ق ئایەتی (٤).

[2]- سورەتی الأنبياء ئایەتی (٢٣).

ئەوکاتی لەدوارۆژ خودای پەروەردگار دەفەرمووێ: ئەی گوێم پێنەدای گوێ بیستی بانگخوازانی ڕێگای ئیسلام بی، بەڵام تۆ گوێت کەر کردبوو لەئاست وەرگرتنی حەق و ڕاستی، ئەی بەندەی خۆم چاوم پێت نەبەخشی تۆ بۆخراپە و سەیرکردنی حەرام بەکارت دەهێنا، لەش ساغیم پێت نەبەخشی کەچی فلان چاوێکی کوێر بوو و دەستێکی ناتەواو بوو، بەڵام هەمووکات بەندەیەکی دڵسۆز بوو لەڕێگای مزگەوت و بەردەوام خەریکی هاوکاری موسوڵمانان بوو دەستی یارمەتی بۆ هەژارن درێژ دەکرد.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَعْتَذِرُوا الْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[1]. واتە: بێ باوەڕ و کافرەکان کە ئەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخ پێیان ئەوترێ: ئەمڕۆ ئێوە هیچ عوزرو بیانوویەك مەهێننەوە و هیچ عوزرێکتان بۆ نیە، ئەم سزای کە ئەدرێن سزای ئەو کردەوانەیە کە لە دونیادا خۆتان کردووتانەو ستەمتان لێناکرێت.

بەڵێ کاتێك دونیا خراپ بوو گەڕاینەوە بۆ لای خودای بەدەسەڵات، ئەو کات هیچ بەهاناو عوزرێکمان لێ قبوڵ ناکرێت، چونکە تازە کار لەکارترازاوەو خودای گەورە لە دونیا تەمەنێکی زۆری پێداین، حەفتا هەشتا ساڵ لە دونیا ژیان، بەڵام هیچ بیرمان نەدەکرد کە ڕۆژێکمان لە پێشە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە، بزانە خوای گەورە لە دوارۆژ بیرمان دێنتەوە دەفەرمووێ: ئایە ماوەیەکی درێژ تەمەنمان پێنەدان بۆچی بیرتان نەدەکردەوە لەخۆتان کە دەبێ بگەڕێنەوە بۆلامان و بمرن.

﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾[2]. واتە: لە وەڵامیاندا خوا دەفەرموێت: ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێ نەبەخشین؟ ئەوەی بیەوێت بیرێك بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە؟!

[1] - سورەتی التحریم ئایەتی (٧).
[2] - سورەتی فاطر ئایەتی (٣٧).

بەڵێ هەتا لە دونیا بوون تەنها کاریان دژایەتی و بێ فەرمانی خوای گەورە بوو، بۆیە هیچ عوزرێکیان بۆ نیە، خوا پرسیارت لێدەکات ئەی بەندەکەم ئایە لە دونیا تەمەنێکی زۆرم پێت نەخشی لەچی سەرفت کرد. پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) دەفەرمووێت: لە ڕۆژی دوایی قاچی هیچ بەندەیەك لە جێگای خۆی ناجوڵێ تا چوار پرسیاری لێ نەکرێت. (لاتَزُولُ قَدَمَا بْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعٍ: عُمُرِهِ فِيمَاأَفْنَاهُ)[1]. واتە: لە ڕۆژی دوایی قاچی هیچ بەندەیەك لاناکەوێت تا چوار پرسیاری لێ نەکرێت تەمەنی لە چی بەسەر برد؟. بۆیە ئەو کەسەی بەردەوامی لە سەرپێچیکردنی فەرمانی خودای گەورە تکایە وریابەوە لە خوا بترسە چونکە لەقیامەت لە بارەگای خودای کارزان بێ پشتیوان و بێکەسین مەگەر کەسێك خوارەحمی پێ بکات. کەوایە تاکەی وازناهێنیت لە سەرپێچکردن و دژایەتی دینی خوا، بزانە لە دوارۆژ هەموو کەس غەمی خۆیەتی ڕزگاری بێت لەسزای خوا، هیچ کەس سودی بۆ کەس نیە تەنها بەرگری لە خۆی دەکات.﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا وَتُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾[2]. واتە: لە ڕۆژی قیامەت هەموو کەس غەمی خۆیەتی، لەسەر نەفسی خۆی مشتومڕ و دەمەقاڵێ دەکات بەرگری لە خۆی دەکات، پاکانە بۆ خۆی دەکات، گوێ بەکەسی تر نادات، ئەو ڕۆژە هەرکەس پاداشتی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەو خەڵکە ستەمیان لێ ناکرێت.

بەڵێ غەمی خۆیەتی ڕزگاری بێت لە ئاگر و سزای پڕ ئێش، حەقی بەکەس نیە غەمی بۆ کەس نیە تەنها خۆی نەبێت، ئینجا هەموو نەفسێك دووشاهێدی لەگەڵە لەڕۆژی دووایی دا، بەڕاستی هیچ عوزر و بیانوویەك نامێنت لە قیامەت بۆ ئەوانەی خراپەکار و دوور لە بەرنامەی خوا سەراپای ژیانی دونیایان بەڕێکرد.

[1] - (رواه الترمذي في كتاب صفة القيامة والرقائق والورع. ٤/ ٦١٢ (٢٤١٧)، والدارمي في المقدمة، ١/ ١٤٤، و أبويعلى ١٣/ ٤٢٨ (٧٤٣٤).

[2] - سورەتی النحل ئایەتی (١١١).







﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ﴾[1]. واتە: ڕۆژی قیامەت دێت و هەموو کەسێک دوو شاهێدی لەگەڵدایە یەکێکیان دەیگەیەنێت و ئەوەی تریشیان شایەتە بە سەریەوە.

بەڵێ دوو شاهێدی لەگەڵە یەکیان دەڵێت: ئەی خوایە فڵانە کەس ئەو تاوانەی کردووە، کەسێکی بەناحەق تووشی کێشە کرد زوڵمی کرد، نوێژەکانی تەرك کردبوو، یان ئەوکارە چاکەو خراپەی کرد، ئەوەی تر شاهێدە دەڵێت: ئەی خوایە ڕاست دەکات من شاهێدم.

بەڵێ هەموو بەڵگەو نهێنیەکانیان لایە، لە ڕۆژی لە دایك بوون تاکاتی مردن، ئەو کاتی ڕۆژی ئاشکرابوونی گشت نهێنی و شتە شاراوەکانە.﴿ يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ﴾[2]. واتە: ئەو ڕۆژەی کە هەموو نهێنیەکان دەردەکەوێت و ئاشکرا دەکرێت.

بەلام بەداخەوە بۆ مرۆڤەکان زۆربێ ئاگابوون لەو باسە و لەڕاستی و ڕێگای حەق لایان دابوو، هەر خۆشی دونیا بێ ئاگایی کردبوون لە ڕێگای خودای گەورە.

﴿لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾[3]. واتە: بەیەکە یەکەی بێ باوەڕان دەوترێت: بەڕاستی تۆ لەم سەرەنجامە بێ ئاگابوویت و گوێی خۆتت لێ خەواندبوو، ئێستا ئێمە پەردەمان لەسەر چاوەکانت لاداوەو هەموو شتێک وەکو خۆی دەبینیت و ئەمڕۆ چاوەکانت تیژە هەموو شتێك ئەبینی ئەوەی کە لە دونیا لێتەوە نادیار بوو ئێستا هەموو ئەبینی.

بەڵێ جا ئەو کەسەی لەدونیا بۆ خودای گەورە ژیا، ئامادە نەبوو قیامەتی کە ژیانێکی هەتا هەتاییە بدۆڕێنێ بۆ دونیایەکی کاتی، بەرگی شەرم و حەیای لەبەر دەکرد،

[1] - سورەتی ق ئایەتی ( ٢١ ).

[2] - سورەتی طارق ئایەتی (٩).

[3] - سورەتی ق ئایەتی ( ٢٢ ).





شەوان هەڵدەستا بۆ شەونوێژ لەترسی خوا ئەگریا، بەنهێنی بێ ئەوەی کەس پێی بزانی یارمەتی هەژار و نەدارەکانی ئەدا، هەموو کات سەروەت و ماڵی لە پێناو خوای گەورە خەرج دەکرد بۆ خزمەتی ئیسلام، بەڵێ بە بێگومانی ئەمانە جێگایان بەهەشتە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا﴾[1]. واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەیان ئەنجامداوە، ئێمە هەر لە زووەوە بەهەشتی فیردەوسمان بۆ ئامادە کردوون، تا لەوێ دابەزن و ژیانی کامەرانی تیایدا بەرنەسەر.

بە پێچەوانەوە ئەوانەی سەرتاپای ژیانیان بێفەرمانی خودای گەورە بوو، هەموو ئامانجیان دژایەتی ئیسلام و موسوڵمانان بوو، ئاگری دۆزەخ شوێنیانە، پەنا بەخودای گەورە. ﴿فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيد﴾[2]. واتە: کەواتە ئێوە هەردووکتان ئەو ئادەمی یە فڕێ بدەنە ناو سزای زۆر سەختەوە.

بۆیە ئەی بەندەکانی خودا با وابکەین بەسەر نەفسی خۆمان زاڵبین کە هانمان دەدات بۆ تاوان و سەرپێچی کردن و لە سنور دەرچوون لە فەرمانی خوا، سوێند بەخوا ئارام گرتن لەسەر ناخۆشیەکانی دونیا کە بەسەر موسوڵمان دێت زۆر باشترە لەوەی لە قیامەت بۆ هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخ بمێنیتەوە، ئەو ئاگرەی لە هەموو لایەکەوە هێرش دێنێت بۆ تاوانبارو خراپەکاران.

﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ﴾[3]. واتە: لە ڕۆژی قیامەت سزا دایان ئەپۆشێ لە هەموو لایەکەوە لە سەروویانەوە وە لە ژێر پێیانەوە.

[1] - سورەتی الكهف ئایەتی (١٠٧).
[2] - سورەتی ق ئایەتی ( ٢٦ ).
[3] - سورەتی العنكبوت ئایەتی (٥٥).

چونکە ئەوانە دژایەتی دینی ئیسلامیان کردووە و بوونەتە دڕکو وداڵی سەڕێگای بانگخوازانی ڕێگای خودا، ئەی ئەوانەی شەو و ڕۆژتان داناوەتە سەر یەك بۆ دژایەتی ئیسلام و موسوڵمانان، ئەی ئەوکەسانەی دڵتان بەدونیا خۆشە، ئەی گەنجەکان ئەوانەی ماوەیەکە بەخۆتان ئەنازن وازتان هێناوە لە بەرنامەی خوای گەورە، ئەی ئەو ئافرەتانەی کە جلی شەرم و حەیاتان فڕێداوە کەوتوونەتە دوای جلی ناشەرعی و نیمچە ڕووت و داوی شەیتان.

تکایە وەرن لەگەڵم با کەمێک بیربکەینەوە لەگەڵ هۆش و عەقڵمان، بۆ ئەو ڕۆژەی دەگەڕێینەوە بارەگای خوای کارزان، زانیمان ئەوانەی لە دونیا بۆ خوا نەژیان چۆن ئاگر پاداشتیانە، جا بیربکەوە لەوکاتەی بەرەو ئاگری دۆزەخ ڕادەکێشرێن و ڕیز دەکرێن.
﴿وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾[1]. واتە: ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ باسی ئەو ڕۆژە بکە بۆ گەلەکەت کە نەیارو دوژمنانی خودا بەرەو ئاگری دۆزەخ کۆ ئەکرێنەوە جا بەڕیز ڕائەگیرێن و دەستە دەستە بەرێدەکرێن بۆ ئاگر.

بەڵێ لەوکاتە کەسێک نیە ڕزگارمان بکات لەو ناخۆشی و سزاییە، بەڵکو ئەندامانی لاشەمان شاهێدی لەسەر سەرجەم خراپەکاریەکانمان دەدەن.
﴿حَتَّىٰ إِذَا مَا جَاءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[2]. واتە: کاتێك کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێن و ڕادەگیرێنو خوای گەورە مۆر ئەدات لەسەر زمانیان، وە گوێو چاو و پێستیان شایەتیان لەسەر ئەدەن لەو کردەوە خراپانەی کە کردوویانە.

بەڵێ هەموو ئەندامەکانی لاشەمان شایەتی لەسەر کردەوەکانمان ئەدەن، زمان لەسەر درۆ، غەیبەت، بوختانکردن بۆ موسوڵمان، چاو لەسەر سیخوڕی و جاسوسیکردن، نەزەرکردن، هەر هەموو لاشەمان دێنە گۆ گەواهی ئەدەن لەبەرامبەر خودای گەورە،

---

[1] - سورەتی الفصلت ئایەتی (١٩).
[2] - سورەتی الفصلت ئایەتی (٢٠).




بزانە لەوکاتە خراپەکاران هەڵوێستیان چی دەبێت بەرامبەر لاشەیان کاتێ هەموو شتێکیان ئاشکرا دەکەن.﴿ وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدْتُمْ عَلَيْنَا﴾[1]. واتە: بە گلەییەوە لۆمەی پێستەیان دەکەن ئەڵێن: بۆچی بە زبانی ئێمە گەواهیتاندا ؟ خۆ ئێمە لەئێوە بەرگری ئەکەین!.

سبحان الله بەڵام لاشەکەیان هەموو کار و کردەوەیەکی نهێنی و ئاشکرای کەسەکە دەخاتە ڕوو، ئینجا بزانە ئەندامەکانی دەبێت وەڵامی چی بێت لەکاتێدا گەواهی هەمووشتێك دەدەن.﴿ قَالُوا أَنْطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنْطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[2]. واتە: ئەڵێن: ئەو خوایەی کە هەموو شتێکی هێناوەتە قسەو گۆ، ئێمەیشی بەقسە هێنا. واتە: بە ئارەزووی خۆمان نەبوو، ئیتر بۆچی گلەییمان لێ ئەکەن؟ هەر ئەویشە بۆ یەکەمجار لەنەبوونەوە ئێوەی بەدیهێنا و هەر بۆلای ئەویش دەگێڕدرێنەوە.

(ئەنەس)ەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێ: جارێك پێغەمبەر (ﷺ)پێکەنی! فەرمووی: (هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ أَضْحَكُ؟) ئایا ئەزانن لەبەرچی پێ ئەکەنم؟!، گوتمان: خودا پاشان پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەزانن، فەرمووی: ( مِنْ مُخَاطَبَةِ الْعَبْدِ رَبَّهُ يَقُولُ : يَا رَبِّ أَلَمْ تُجِرْنِي مِنْ الظُّلْمِ ؟ قَالَ يَقُولُ بَلَى. قَالَ فَيَقُولُ فَإِنِّي لَا أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلَّا شَاهِدًا مِنِّي،قَالَ فَيَقُولُ: كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيدًا، وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ شُهُودًا. قَالَ فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ فَيُقَالُ لِأَرْكَانِهِ: انْطِقِي، قَالَ فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ قَالَ ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلَامِ قَالَ فَيَقُولُ: بُعْدًا لَكُنَّ وَسُحْقًا فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ )[3]. واتە: لە قسەو گفتوگۆی بەندەیەك لەگەڵ خوای خۆیدا ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئایا بڕیار نەبوو لەغەدرو ستەم پەنام بدەیت. خودا ئەفەرمووێ: بەڵێ بڕیار وابوو! ئەوسا بەندەکە ئەڵێ: دە من بۆ ئەوە لە خۆم نەبێ شایەد قبووڵ ناکەم، خوا ئەفەرمووێ: هەر خۆت بەشایەت بەسیت،

[1] - سورەتی الفصلت ئایەتی (٢١).
[2] - سورەتی الفصلت ئایەتی (٢١).
[3] - ( رواه مسلیم. ژمارەی فەرمووده: ( ٥٢٧١ ).




ئەڵێ: ئەوجا مۆر لەسەر دەمی دەدرێ، جا بەئەندامەکانی لاشەی دەوترێ: ئادەی ئێوە قسە بکەن! ئەوانیش دێنە قسەو، مۆڵەت دەدرێ، ئەوجا پێیان ئەڵێ: دەك دوور بن لەرەحمەتی خواوە دوور بن و تیابچن، خۆ من لەئێوە دیفاع و بەرگریم ئەکرد.

ئینجا براو خوشکانی من با لە ئیستاوە واز لە دژایەتی بەرنامەی ئیسلام و تاوانکردن بێنین کە دەبنە هۆی چوونە ئاگری دۆزەخ پەنا بە خودای گەورە.

با موحاسەبەو لێپرسینەوە لە نەفسی خۆمان بکەین، ڕێگری بکەین لەکاری خراپ و سنوربەزاندنی سنوری خودای گەورە، پێش ئەوەی بەهۆی کردەوەکانمان لێپرسیەوەمان لەگەڵدا بکرێت و، سزا بدرێن بە ئاگری دۆزەخ.

پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب) (خوالێی ڕازی بێت)دەفەرموێت: (حَاسِبُوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُحَاسَبُوا وَزَيِّنُوا لِلْعَرْضِ الْأَكْبَرِالدونيا)[1]. واتە: لەنەفسی خۆتان پرسنەوە لێرە لەدونیا پێش ئەوەی لێتان پرسرێتەوە لەوێ لەقیامەت، وەکردەوەکانتان بکێشن و هەڵی سەنگێنن پێش ئەوەی لەوێ بۆتان بکێشرێت و بۆتان هەڵبسەنگێنرێت.

کەوابوو تا لە ژیانین نەمردووین بابگەڕێینەوە بۆ باوەشی بەرنامە جوانەکەی ئیسلام، با هەمیشە قیامەت و ترسی خوای گەورە لەبیر نەکەین، تا لە دوارۆژ ئەندامەکانی لاشەمان شایەتی چاکەمان بۆبدەن بۆ ئەوەی بەهەشتی نەبڕاوە مسۆگەر بکەین بە ئیزنی خوای گەورە.



[1] - تاريخ عمر/ابن الجوزي ص (٢٠١).





# هۆکاری فریودانی ئافرەتان

هۆکارو هۆی سفوری لە نێو خوشکانی ئەم سەردەمەی غوربەتی ئیسلام گەلێك لە زیاد بووندایە، ئەو خوشکانەی بەپێی فەرمانی خوای گەورە ئەجوڵێنەوە، نمونەی ئەستێرەی درەوشاوەن لەنێو ئاسمانێکی تاریکی شەوەزەنگدا.

ئەو خوشکانەی سەر ڕاستانە وابەستەن بە فەرمانی خوای گەورە زۆر کەم و نامۆن، لە شوێنە گشتیەکان، بازاڕ، زانکۆ، پەیمانگا ..هتد زۆر بە ئەستەم تاك تاکە ئەیان بینی کە باڵاپۆشی شەرعی بن.

هۆکاری سەرەکی بڵاوبونەوەی خراپەکاری و سفوری لە نێو خوشکانی موسوڵمان لەم ڕۆژگارەدا زۆرە، کەبریتین لە ئافرەتە گۆرانیبێژە بێڕەوشتەکان، بەشێك لەمامۆستایانی زانکۆ و پەیمانگا و قوتابخانەکان و، فیلمە دۆبلاژکراوەکان، کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.. هتد.

ئەمانە و چەندان هۆکاری تر، بوونەتە بەربەستێکی دژوار و سەخت، لە بەردەم ئەو خوشکانەی کەدەیانەوێ بێنە نێو بازنەی شەرم و شکۆی ئەم ئیسلامە بێگەردە، تاکو ببەنە باڵا پۆشی شەرعی.

ئەم کۆمەڵە دونیا پەرستە بە ئاشکرا بانگی شوێنکەوتووانیان دەکەن بۆ ڕێگای گومڕای و ئاگری دۆزەخ، پەنا بەخوا .

﴿أُولَٰئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ﴾[1]. واتە: ئەو خوانەناس و بێ باوەڕانە بانگەوازی خەڵکی دەکەن بەرەو دۆزەخ.

بەڕاستی ئەی خوشکی من لە بەرامبەر بە گوێ کردنی ئەو کەسانە دواڕۆژێکی ڕەش و سەخت لە لای خودای گەورە چاوەڕێ یە!.

بۆیە بەگوێی ئەو بانگەوازکەرانەی ئیسلام بکە کە بانگت دەکەن بۆ خۆشبەختی و

[1] - سورەتی البقرە ئایەتی (٢٢١).

ئەوانەی بەڕاست و دڵسۆزی بانگت دەکەن بۆ گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە و ڕێگای بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت.

﴿وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ﴾[1]. واتە:خوای گەورەش بانگەوازی مرۆڤەکان دەکات بۆ بەهەشتی پڕ لەشادی و ئاشتی و ئارامی.

زۆرێک لەئافرەتان لەم سەردەمەی غەربییەدا گرنگی بە فەرمان و واجبەکانی خوای گەورە نادەن، بەڵام بۆ فەرمانی خراپەکاران گوێڕایەڵن، لە زانکۆ و پەیمانگاکان ئەگەر هاتوو بە ئافرەتێك بڵێین سەیرکە مامۆستای فڵان بابەت و فڵانە وانە ئاوایە، مۆدێلی جلی ئاوایە ئەو شوێنەی تەسك و ئەو شوێنەی کورتە تۆش وابکە!، بەڵام لە بیر نەکەی ها دەزانی برۆی زۆر باریکش بوو، ئەوجا بۆ بەیانی چاو لە مامۆستاکەیان ئەکەن، یاخود کچی تر هەن چاو لە ستایلی گۆرانیبێژە فاشلە دوور لەڕەوشتە ئیسلامیەکان دەکەن، ئەو خوشکانەی ئیمانیان لاوازە چاویان لێدەکەن و ڕێگای شەرم و حەیا واز لێدێنن.لە پێناو وتەی خەڵکی نەفام و نەزان تاکو بڵێن کچێکی جوانە!، یاخود بە جوانی خۆیان ئەنازن، چاو لە گۆرانیبێژ و ئەکتەری فیلم و سینەما ناپوختەکانی دوور لە ڕێبازی ئیسلام دەکەن، دەیانکەن بە پێشەنگی خۆیان لە کاتێکدا خۆیان بێ موسوڵمانە، کەچی هەر ڕۆژەو چاو لە ستایلی یەکێك دەکەن!.

خوشکانی موسوڵمان دەبێ چاو لە ئافرەتانی هاوەڵان بکەن و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەنە پێشەنگ و پێشەوای خۆتان و هەر فەرمانێکی کردبوو پێمان، بێ یەك و دوو ئەوە جێبەجێی بکەین چونکە سەرفرازی دونیا و دوارۆژی لەگەڵە .

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾[2]. واتە: جا ئەوەی گوێڕایەڵی خوا پاشان پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوە بەڕاستی ئیتر سەرکەوتن و سەرفرازیەکی بێ ئەندازەو بێ سنووری لە دونیا و قیامەت بەدەستهێناوە.

---

[1] - سورەتی یونس ئایەتی (٢٥).

[2]- سورەتی الاحزاب ئایەتی (٧١).





ئێمە کاتێك ئەڵێین ئەو خوشکانەی نیمچە ڕووت و پۆشتەنین و جلی ناشەرعی لەبەردەکەن دەبن بە هۆکاری توڕەبونی خودای گەورە، پاشان بەچاوێکی کەم سەیرکردنیان لە لایەن ئیماندارانەوە، لەو لاوە چەن کەسانێکی کاڵ فام، دژایەتیمان ئەکەن بەوەی هێرشمان کردۆتە سەر ئافرەتان و مافمان پێشل کردوون، پێمان ئەڵێن: برا، وازبێنە، چیدەکەن با بیکەن، ئازادن ئەوکەسانەی وادەڵێن ئازادبن ڕاستیان نەوتووە، دڵ ڕەشن، نوێنەری شەیتانن لەسەر زەوی، تەنها دەیانەوێ خراپەو بەد ڕەوشتی لە نێو کۆمەڵگای موسوڵمانان بڵاوبێتەوە، تاکو نەفسی ناپوختیان تێربکەن، بە تێڕوانین بۆ سفوری و بەدیارەوە بوونی لاشەی ئافرەت. بەڵێ براو خوشکانم ئافرەت لای ئەوان تەنها بۆ تێرکردنی هەوەس و ئارەزووی چڵکن و ناپوختیانە، دەیانەوێ مافی ئافرەت وەك بێبڕواکانی ڕۆژئاوا لێبکەن، کە بێ ڕەوشتی بە ڕادەیەك پەرەبسێنێت، لە سەر شەقام وبازار و بن دیوارەکان، ئافرەت لاشەی هەڕاج بکات و لەشفرۆشی بکات، بەچەن دۆلارو دینارێك، بۆئەوەی بە ئارەزووی خۆیان کام ئافرەتی کچ و جوانە داوێن پیس بکەن، تاوەکو شەو و ڕۆژیان لەگەڵ بەسەر ببەن، دواتر وازی لێ بهێنن، ئەمەیە ئەو مافەی بۆ ئافرەت دەیخوازن و ئاوات و ئاخی بۆ هەڵدەکێشن. ئەوجا دێن دژایەتیمان دەکەن، دەڵێن کاکە تۆ ئیسلامت قورسکردوە مافت لە ئافرەتی بەستەزمان زەوتکردوە، بەداخەوە خۆزگە ئەو خوشکانەی نیمچە ڕووتن لە ڕاستی قەسەکانمان حاڵی دەبوون، کە ئێمە لەخەمی تۆ داین، تاکو نەبیتە یاری دەستیان و بەئارەزووی خۆیان یاریت پێبکەن. وەرن ئەی خوێنەرانی خەمخۆری ئەم ئیسلامە، ئەی ئەو خوشکانەی فریودراون بەقسەی باق و بریقی کۆمەڵێك مرۆڤی نەخۆش!، وەرن با سەیری وڵاتی ئەڵمانیا بکەین بە نمونە، چۆن یاری و ئیهانە بە مافی ئافرەت ئەکەن، بۆخۆشی خۆیان هەموو شتێک ئەبەخشن لە پێناویدا تاکو بەدەستی بهێنن. بەڵێ لە ئەڵمانیای بەناو ئازادی و دیموکراسی خواز نووسینگەیەکیان کردۆتەوە، بۆ هەڕاجی ئافرەت، نەمانی شکۆ و حەیا و شەرمیان نووسینگەیەك هەیە کە نزیکەی (٣٠٠) کچی تەمەن (١٨) ساڵ و (١٩) ساڵ و (٢٠) ساڵ خۆی ناو نووس کردووە،





بۆ ئەوەی کچێنی خۆی بفرۆشێ، ئەم کچانە کەخۆیان هەڕاجکردووە، هەر پیاوێك پارەی زیاتر بدات ئەو پیاوە ئەبێتە خاوەنیان بۆ شەوێك کەوا کچێنی خۆیانی پێ بفرۆشن! ئەم نوسینگەیە ئاشکرای ئەکات، یەکێک لەم کچانە لەلایەن پیرە پیاوێکی دەوڵەمەندی (٧٨) ساڵانی خەڵکی هۆنکۆنگ بەبڕی (٢) دوو ملیۆن و سێ سەت هەزار یۆرۆ) کڕا، بۆ تەنها یەك شەو کە ئەو پیرە پیاوە لەگەڵی بخەوێ و ڕابوێرێ ![1]

ئەمەش ڕۆژئاواو کۆیلایەتی و هەڕاجکردن و کڕین و فرۆشتنی کچان و بەکەم زانینی ئافرەت، خەڵکێکی دڵ نەخۆشیش دێت دەڵێت مافی ئافرەت لە ئەووڕپاو ئەمریکایە، بەسە وازبێنن لەباسی پۆشتەی ئافرەت تاوەکو لە کۆمەڵگای موسوڵمانانیش ئاوا ئافرەت هەڕاجی لاشەی بکات. بزانە خوشکی من لەغەمی تۆ داین و خۆمان ماندوو ئەکەین لە پێناو ژیانی تۆ تاوەکو لێمان تێبگەیت نەبیتە نێچیریان و ڕاوت بکەن، بەڵکو دەمەوێت تۆ ژیانت خۆشبێ و بێ کێشە بیت و نەبیتە یاری دەستی نامەردەکان سەربەرزانە بژیت و ببیتە موڵکی یەك پیاو بەهەموو دونیات نەگۆڕێتەوە. بۆیە کە دەڵێین واز لە جلی نیمچە ڕووت بێنە، خۆت پۆشتە بکە بەجلی شەرعی، لێمان تێبگە بۆباشی تۆمانە چونکە ئەوکات سەرفراز ئەبیت، بەختەوەرئەبیت، ئەمە بەڵێنی خوای پەروەردگارە، هەرکەس گوێڕایەڵی فەرمان و واجبەکانی ئیسلام بوو، کە تاکە بەرنامەی خوای گەورەیە لەسەر زەوی، ئەوکات ژیانێکی خۆش و بەختەوەری بۆ دەبێت.

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ﴾[2]. واتە: هەرکەسێک کارو کردەوەی چاکەی کردبێت، پیاو بێت یان ئافرەت لە کاتێکدا بڕوادارو ئیمانداربێت ئیسلام بەرنامەی بێت، بەراستی و بەبێ گومان بەژیانێکی کامەران و ئاسوودە لە دونیادا دەیژیەنین.

---

[1] سەرچاوەی ئەم باسە لەم لینکەوە بخوێنەوە.
online/ https://www.cnet.com/news/teen-reveals-aftermath-of-selling-her-virginity

[2] - سورەتی النحل ئایەتی (٩٧).





بەڕاستی نەمان دیوە لەهیچ ئاینێك و شەرعێك و یاسایەکی جیهاندا، کە مافی ئافرەت درابێ وەك لەئیسلام دراوە، لە دابین کردنی مافەکانیان و چاودێری کردنیان و ڕێز لێ گرتنیان، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ بێ باوەڕان و دووڕوان و ئەوانەی نەخۆشی لەدڵیاندایە سینگیان ئەکوتن و دەیانەوێت ئەو ڕێزو مافانە کە ئافرەتی موسوڵمان بەدەستی هێناوە بە بای گەردەلولی ڕەشیدا بدەن، ئەو ڕێزو ماف و سەربەرزی پارێزراوەی لەئیسلامدا هەیەتی تووڕەی کردوون و ڕقی جوڵاندوون، چونکە ئەوان ئەیانەوێت ئافرەت سووك بکەن و بیکڕن وبیفرۆشن بەکاری بێنن بۆ مەرامی پیسیان و حەز و ئارەزوو تێرکردنیان، ئەیانەوێت ئافرەت ببێتە ئامێری ڕووخاندن وداوی ڕاوکردنی ئیمان لاوازو ئارەزووە ملکەچیەکان، پاش ئەوەی کە ئارەزووە پیس و گڕ سەندوەکانی خۆیان تێرکردووە.

ئای خوشکی من خوشکی بەڕێزم خۆزگە ئەتزانی و بیرتکردبایەوە بەو ئەقل و هۆشەی خودای گەورە پێی بەخشیوی، بە گوێی خراپەکارو دڵ ڕەش و ناپوختەکانی ڕۆژگارت نەکردبا، بەگوێ نەفست نەکردبا بەڵکو فەرمانی خودای گەورەت لە سەروی هەموو فەرمانێك دانابا دڵنیابە واللە پاشان واللە بەهەشت دەرگات بۆ ئەکاتەوە لەبەرزترین و شوێن و مەکانیدا.

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[1]. واتە: ئەو کەسانەش باوەڕیان هێناوەو کارو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، هەر ئەوانن نیشتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر.

بەڵێ خوشکم تکات لێ دەکەم زەین و هۆشی دڵت لای من بێت بزانە ئەمڕۆ سەردەم سەردەمی فیتنەو بەڕێ لابردنە بۆ گومڕای، لە بازاڕی قیامەت بۆ بازاڕی شەیتان، ئەوە بزانە ئەی خوشکە ژیرەکەم تۆی ئافرەت زۆر بەنرخ و گرانبەهای، بزانە چۆن ئەو پیرە پیاوە، دوو (٢) ملیۆنی داوە تەنها بۆ شەوێک ڕابواردن بۆئەوەی خۆشی خۆیان بەتاڵ بکەنەوە تەنها بۆ خۆشی تۆیان دەوێت.

---

[1]- سورەتی البقرة ئایەتی (٨٢).

بۆیە ئەی خوشکم ئاقڵ و ژیرانە هەڵس و کەوت بکەو بجوڵێوە بەرامبەر نەفسی خراپەکاریان، وا مەکە ببیتە هۆی دڵخۆشکردنیان بە خۆدەرخستن بۆیان، نەکەیت بەهیچ جۆرێك ئەی خوشکی ژیر جوانیت دەربخەی و دڵیان خۆشبکەی، چونکە هیچ کات بەقەدد ئەو کاتە دڵخۆشترنین، کەتۆ خۆت ڕازاندۆتەوە، جوانیت بۆیان بە دەرئەخەی، ئەوان ئەوەیان پێخۆشە، لای وان گرنگ نیە کە تۆ سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە ئەکەی یان نا!.

ئەی خوشکە بەڕێزەکەی من ئەمانە نەفس نزمی چاو برسی دڵ پڕ لە ژەهرن ئەگەرێن تا بەنێچیرێکەوە دەن، پێش ئەوەی تۆ بێیتە دەر لەماڵ ئەمان لە دڵ و فکریان وێنەو پیلانت بۆ ئەکێشن چۆن ژەهرەکەیانت پێ برێژن و لە کام لاوە لای سەرتەوە، یان قاچەکانت، یان تەنیشت و لای چەپ ڕاستەوە بۆت بێن، شەرەف و ناموس و ڕەوشتی جوانت لای خەڵکی بێ ڕێزبکەن و سوکت بکەن، تکایە تۆ چۆن خۆتیان بۆ ئەڕازێنیتەوە دڵیان خۆش ئەکەیت تکایە وریا و وشیار بەو و بەئاگا وەرەوە.

کەوایە لە ئێستاوە بڕیاربدە بۆ خودای گەورە خۆت یەکلا بکەوە بە دڵسۆزی تا لە قیامەت پێت بفەرمووێ: ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ﴾[1]. واتە: دەرگاوانانی بەهەشت پێیان ئەڵێن سڵاوو درووودتان لەسەربێ، بەخێر هاتن، خۆتان پاك ڕاگرت لە دونیادا، فەرمانی خواتان نەشکاند و هەوڵتاندا و تێکۆشان و پاداشتیشتان لێرەدا پاك و خاوێنە، یا خوا نۆشتان بێت دە بچنە ناو بەهەشت بەهەتاهەتایی لەوێدابن.

بۆیە خۆت بێبەش مەکە لەو پاداشتە مەزنە کەبەهەشتی نەبڕاوەی پڕناز و نیعمەتە، نەکەی بەهیچ شێوەیەك لە دەستی بدەی لە پێناو خۆشی کەمی ئەم دونیا کاتییە کە زوو تەواو دەبێ و دەبڕێتەوە.

[1] - سورەتی الزمر ئایەتی (٧٣).





# لێپرسینەوە لەنەفست بکە خوشکم

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گەنجەکان دوورە پەرێز بوونە لە ئیسلام و کەوتوونەتە دوای حەزو خولیای نەفسیان، هەوڵنادەن لە ئیسلام شارەزابن تەنها بەدوای ڕابواردن و خۆشیەوەن، لەو لاشەوە ئافرەتان جوانی و ڕازاوەی خۆیان بەدەر ئەخەن بۆ غەیری پیاوی خۆیان، گەنج کە ئەبینێ کچ چۆن خۆی ڕازاندۆتەوە، لەکاتێکدا جوانیەکەیان دەستکردە هی خۆیان نیە، کۆڵێك موکیاج و برژانگی دەستکردو دەرزی لە ڕوومەت و لێویان ئەدەن جلێکی نیمچە ڕووت و تەسك دەکەنە بەریان، بەلای گەنجەکان دا دەڕۆن و شەیتانی نەفرەتی وایان لێدەکات توشی نەزەر و تاوانی گەورەیان بکات، وایان لێدەکات زیاتر دووربکەونەوە لە عیبادەت بۆ خوای گەورە.

بۆیە ئەی خوشکی بەرێزم ئایە تاکەی نابی بە بالآپۆش؟! ئەوە بزانە تۆی بەرێز هەروا بەبێ هۆ بۆ گاڵتە دروست نەکراوی، تەنها بۆ ڕابواردن و بێفەرمانی خودا بژیت تەواو وازت لێ بهێنرێ، بەئارەزووی خۆت بخۆی و بسورێیتەوە.

﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾[1]. واتە: ئایا ئادەمیزاد وادەزانێت هەروا وازی لێدەهێنرێت بەخۆڕایی تووشی لێپرسینەوەی نابێت؟!.

ماوەیەکە لە ژیانت دوور لەبەرنامەی ئیسلام تەمەنێکی زۆرت بەڕێکرد، بزانە بەخۆ جوانکردن و ڕازاندنەوە، تۆ ئەبیتە هۆی بەلارێدانی گەنجانی موسوڵمان لە بەرنامەی ئیسلام، ئەو گەنجانەی ئەم سەردەمە مێشك و ئەقڵیان وەستاوە، کە ئەبینن ئافرەت چۆن خۆی ڕازاندۆتەوە، حەزو ئارەزوویان هانیان ئەدات بۆ تاوان، جا بۆیە دوور ئەکەونەوە لە واجبەکانی خودای گەورە کە کاتی نوێژە، ئەو گەنجانە ئەچنە بازاڕ بەبێ ئیش و کار دینارێك لە گیرفانیدا نیە بۆ پێداویستەکانی، تەنها بۆ ڕابواردن و تێرکردنی نەفس و سەیرکردنی ئافرەت ئەچن.

---

[1] - سورەتی القیامة ئایەتی (٣٦).





یان ئەچنە پارك و باخچە گشتیەکان یاخود بەردەم زانکۆ و پەیمانگا و قوتابخانەی کچان هەر بۆ ئەم مەبەستە شەیتانیە، جا کەوابوو تێبگە ئەی خوشکی ژیرو ئاقڵم، مەبە هۆکاری فیتنەو ئاژاوە و دوورکەوتنەوەی گەنجان لەدین، چونکی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هۆشیاری کردوینەتەوە کە هاوار و وەیل بۆ ئەو کەسانەیە ئەبنە هۆی کردنەوەی دەرگای خراپە و تاوان، هەروەك فەرمووبەتی:

(وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفَاتِيحَ الشَّرِّ عَلَى يَدَيْهِ)[1]. واتە: هاوار و وەیل بۆ ئەو کەسەی کەئەبێتە هۆکاری کردنەوەی کلیلی شەڕ وخراپە.

زاناکان دەفەرمون: وەیل تیاچوون و لەناوچوون و سزای سەختی دۆزەخە پەنا بەخودای گەورە.

ئەی خوشکی من ڕەحمەتی خوای گەورەت لێبێت بزانە دونیا ئەوەندە ناهێنێت تۆ قیامەتی بۆ بدۆڕێنی، ئەم دونیایە جێگای ئومێد و هیوا نیە دڵت خۆشبکەی بەوەی هەر بمێنیەوە، ئەم دونیایە بۆ پێغەمبەران نەبوو کە نوێنەرو پەیام گەیەنەری خودای گەورە بوون (سەلامی خوایان لەسەر بێت)، بۆ مرۆڤایەتی بۆ ڕزگارکردنیان لە شەوەزەنگی تاریکی بۆ ڕووناکی و باوەشی یەکخواپەرستی، بۆ هاوەڵان و پیاوچاکان و زانا و خواناس و چاکەخوازان نەبوو کە هەموو ژیانیان بۆ پەرستن و بەندایەتی خودای گەورە بوو ئێمەی تاوانبارو زەبوون و زەلیلی بێ دەسەڵات چین تا دڵمان پێ خۆشبکەین و بۆ ئێمە بێت، و هیوای مانەوەمان پێی هەبێت؟

چاك بزانە خودای گەورە بە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : پێش تۆ هەموو کەسێك مردووە هەر لە ئادەم پێغەمبەر(علیه السلام) تا گشت ئەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ هاتوون هەموویان بەگەل و قەومەکانیانەوە مردوون ئەی پێغەمبەر(ﷺ) جا کە وابوو دەبێ تۆ و گشت خەڵکی بمرن .

[1] - سنن ابن ماجه، ژمارەی فەرموودە: (٢٣٧)، السنة لابن أبي عاصم، ژمارەی فەرموودە: (٢٩٧).





﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ﴾[1]. واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لە پێش تۆدا ژیانی بەردەوامی بەهیچ مرۆڤێکمان نەبەخشیوە هەموویان مردوون.

بەڵێ خودای گەورە دەفەمووێ: هیچ مرۆڤ و کەسمان نەهێشتەوە گیانی نەکێشین هەموومان مراند ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، جا خودای گەورە پرسیار دەکات و دەفەرمووێ: ئایە ئەگەر تۆ بمری ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو خەڵکە دوای خۆت ژیانی هەتا هەتایی دەبێت و نافەوتێن؟، هەر لەم دونیایە دەمێننەوە نامرن؟، با هەر بەدوای ڕابواردن و خۆشیەکان بێ و خەریکی بەرزکردنەوەی خانوو و سەیارەی مۆدێل بەرز و گەشت و گوزارو و ڕابواردن و خۆڕازاندنەوە دەبن و بەخۆیان بنازن و خۆیان هەڵبکێشن کەبەهێزن و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە ببێتە پیشەیان، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ﴾[2]. واتە: ئایا تۆ بمری و خەڵکی دەمێننەوە؟ نەخێر هەرگیز شتی وانییە ئەوانیش وەکو تۆ ئەمرن و کەس نامێنێت.

کەوایە بیرت نەچێ ڕۆژێک کە هیچ گومانی تێدانیە ئەمریت و گیانت لەلاشەت دەردەچێ، بۆیە تۆش دەمریت و کەس نامێنێت لەسەر زەوی، خۆ پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویسترین کەسە لای خوای پەروەردگار بەڵام دونیا بۆ ئەویش نەبوو، وەفاتی کرد بەدایک و باوکەوە بەقوربانی بین هیچ خۆشی نەبینی بۆیە ئێمەی گوناهبار چین تا دڵمان خۆشبکەین بەمانەوەی یەکجاری لەم دونیاییە!؟.

بەڵێ ئەی خوشکە بەڕێزەکەم ئەگەر گومان ببەی کە تۆ جوانی، بۆیە خۆت باڵاپۆش ناکەی یانی تاوەکو پێت بڵێن: ماشاءاللە زۆر جوانی، ئەوە بزانە لە تۆ زۆر جوانتریش هەن، جوانی تەنها بۆ کەسێك نیە بەڵکو لە جوان جوانتریش هەن جا بۆیە بەجوانیت هەڵمەخەڵەتێ و پێی سەرسام مەبە.

---

[1] - سورەتی الانبیاء ئایەتی (٣٤).

[2]- سورەتی الانبیاء ئایەتی (٣٤).





چونکە جوانیش تا سەرنیە ساڵ بە ساڵ جوانیت کزو لاواز و چرچ و زبر ئەبێت، سەرت سپی و پشتت کورئەبێ، جوانییەکەت نامێنێت و پیرو پەکەوتە ئەبیت.

بەوانەش هەڵمەخەڵێ کە جوان و ڕازاوەن لە فیلم و شوێنە گشتیەکان چونکە ئەوە بزانە گشتی بۆتە دەستکردو و جوانی خۆیان نیە بەشێکی زۆری دەستکردەو دکتۆر بەدەرزی وایان لێدەکات و کاتیە، پاش ماوەیەك پیرەژنە سەد ساڵیەکان لەچاو ئەوان حۆرین، بۆیە پێیان هەڵمەخەڵەتێ و قیامەتت بۆ ئەوان مەدۆڕێنە.

ئەی چ شتێکە وا دەکات دوور بیت لە بەرنامە و ڕێبازی ڕاستەقینەی خوای گەورە کە باڵاپۆش نەبی؟، ئەی تۆ ناڵێیت من موسوڵمانم؟، لە خوا دەترسم و پێغەمبەرم (ﷺ) خۆشدەوێ؟!

تکایە ئەی خوشکی بەرێزم موسوڵمانیەتی ئاوایە بێفەرمانی خوای گەورە پاشان پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکەی؟ چۆن ترس و شەرمی خوای گەورە ناتگرێت بەوەی فەرمانی پێشل بکەی و سنوری قەدەغە کراوەکانی بشکێنیت؟.

کاتێك بە خوشکێك ئەڵێیت بۆ باڵاپۆش نیت؟ ئامۆژگاری ئەکەیت و قیامەت و مردنی بیردێنیتەوە، پێت دەڵێت برام منیش هەموو شتێك ئەزانم کەوایە تۆ هەمووشت ئەزانی ئەی بۆ فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ ناکەی تۆ ئەزانی خودای گەورە دروستی کردووی رزق و ڕۆزی پێداوی ئەزانی دەمری بەتەنها ئەچیتە ژێرگۆڕی تەنگ و تارو حەشر و حساب و لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێ، هەمووشتت زانی ئەی چیە بۆ ترسی خوا نات گرێ مەگەر دڵت بۆتە بەرد چ شتێکە بۆتە بەربەست و ناهێڵێ بێیتە ناو خۆشی ئەم ئیسلامە پاك و بێگەردە؟.

گەر لە ڕاستی و حەقیقەتی ئەم ئیسلامە بە جوانی و بە ویژدانەوە تێگەیشتبای دڵنیابە پۆشاکی شەرعیت ئەپۆشی تاکو بەس سەیرت نەکەن، تۆ نازانی ئەم ئیسلامە تاکە ڕێبازو بەرنامەی خوای گەورەیە کە هەموو فەرمان و یاساییەکی بێ حیکمەت نیە ئیلا قازانج و چاکەیەکی تێدایە بۆ مرۆڤەکان.





خوای گەورە مرۆڤی دروستکردووە هەرخۆشی شایەنی فەرمان پێکردن و ڕێگریکردنی مرۆڤە بۆ گشت کاروبارێکی دونیا.
حیجاب و باڵاپۆشی یەکێکە لە فەرمانەکان کە خوای گەورە تایبەتی کردووە بە چینی ئافرەتانی موسوڵمان کە جێبەجێی بکەن بەمەرجێك لە بەرنامەو دینی ئیسلامدا بێت چونکە هەر کارێك و کردنی هەر فەرمانێك لە دەرەوەی بازنەی ئیسلام قبوڵ نیە.
حیجاب دەبێتە هۆی ئەمن و ئاسایش و ئارامی و سەرکەوتنی کۆمەڵگا، دەبێتە قەڵایەکی پتەو بۆ دەست درێژی نەکردنە سەر ناموس و شەرەفی ئافرەتان.
ئەو کەسانەی نیازی خراپیان هەیە بۆسەر ئافرەتان گەر زانی ئەو کەسە لەخواترسەو باڵاپۆشێکی پارێزگارە هەرگیز ناتوانێ و ئەترسێت زەفەرو خراپە و دەست درێژی بکاتە سەری و پێی ڕابوێرێ و هەڵیخەڵەتێنێت و هەمیشە لە بازاڕ و زانکۆ و شوێنەکان خۆی ئەپارێزێ لەو خوشکەی باڵاپۆش و داپۆشراوە.
ئەگەڕێت بەدوای ئەو ئافرەتەی کە دوورە لە ڕەوشت و ڕێبازی ئیسلام تاوەکو ڕاوی بکات و بە قسە پڕوپوچەکانی هەڵی بخەڵەتێنێت و، تەنها توانای هەیە لەسەر ئەو ئافرەتانەی کە دوورن لە دین و ساویلکە و ئیمان لاوازن.
بەڵێ خوشکم تکایە بە هۆش خۆت وەرەوە لە ئێستاوە تا نەمردووی فرسەتە بۆت تاوەکو توشی سزاو ئازارو نەخۆشی وتاقیکردنەوەی سەختی خوای گەورە نەبووی هەر لە دونیا، دواتر سودی نیە پەشیمانی، بۆیە تکایە کەمێ بیربکەوە لەگەڵ نەفسی خۆت، بەنەفست بڵێ من ڕۆژێك دێ ئەمرم بڵێ ئەی نەفسی سەرکەش بەجێی دێڵم ئەم دونیا کاتیە، کە مانەوەی یەکجارەکی لە قیامەتی نەبڕاوەی هەتا هەتاییە.
ئەی نەفسە خراپەکەم بۆچی تامەرگ نەبۆتە میوان و لەدەرگای نەداوین وازنەهێنین لەسەرپێچی کردن ؟!
ئەی نەفس بۆچی وام لێدەکەی خۆم بڕازێنمەوە بۆگورگە برسیەکان !؟
ئەی نەفسەکەم دەتەوێ بەوشێوەیە بەڕێزبم بەخۆ دەرخستنم بۆ خەڵکی جوانیم پیشانیان بدەم ؟!




ئەی نەفسەکەم دەتەوێ تاکەی بەردەوامبم لە سەرپێچی کردن وا تەمەنم بەرەو پیری ڕۆیشت و تەمەنی لاویم وەگ گەڵای پایز هەڵوەری؟!

ئەی نەفس تۆ زۆر بێ وەفای هەر کەپیربووم پشتم لێ ئەکەی و بەجێم دێلی!

چونکە دەزانی ئەو جوانیە سەرنج ڕاکێشەم نەما و گەنجان ئیشیان پێم نەما !!

چونکە بێ هێزو دەست لەرزۆک بووم بۆیە بەتەنها ئەمێنمەوە بێ ئەوەی توێشوم کۆکردبێتەوە بۆقیامەتم !

ئەی نەفسە بێ ویژدان و خراپەکارەکەم تۆ کەمێك گوێم بۆبگرە با بۆت باس بکەم وا ئێستا گەنجم و خەڵکم سەر قاڵ کردووە بەخۆ دەرخستنم بەڵام بەیانی وا لەژێر گۆڕم بەتەنها و بێکەسی !

بۆیە نەفسەکەم تاکو نەمردوم با واز لە تاوان بێنم بەسە کە دووری خستومەتەوە لەیاد و ڕێبازی خوای گەورە !

ئەی نەفسەکەم با بە جوانیەکەمان هەڵنەخەڵتێین کەگەنجەکانمان دوور خستۆتەوە لەڕێگای خوا، بەیانی گەنجی و جوانیەکەمان ئەبێتە خۆراکی کرم و حەشەراتی نێو گۆڕ!

ئەمڕۆ لەسەر زەویم و بە ئارەزووی خۆم دەجوڵێمەوە دێم و دەچم، بەڵام بەیانی وا لە ژێر خاکم (دەبست) شوێنمە !

لەژێر گۆڕ هیچ سوودی نییە بۆم ئەو جوانیەم کەپێی سەرسام بووم خەڵکم پێ لەڕێگای خوا لائەبرد تەنها ماڵ وێرانیە بۆخۆم !

چونکە لەبێ فەرمانی خوای پایەبەرز بەکارم دەهێنا تا هاوڕێکانم بڵێن وای کچێکی چەن جوانە !

بەڕاستی ئەی نەفسەکەم گومڕا بووبووم کەپشتم لەیاد و بەرنامەی خوای گەورە کرد. ﴿تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾[1]. واتە: لەقیامەت لەبارەگای خوای گەورە تاوانباران سوێند بەخوا دەخۆن دەڵێن ئێمە لە گومڕایی یەکی ئاشکرادا بووین.

---

[1] - سورەتی الشعراء ئایەتی (٩٧).





بەڵێ ئەی نەفسە خراپەکارەکەم تیاچوون بۆئێمە کە بەگوێی تاوانبارانمان ئەکرد کاتێ بەقسە خۆشەکانیان ئەیان وت: دەخۆت جوان بکە دەی خۆ دونیا خراپ نابێ با گەنجەکان سەیرت بکەن.

﴿وَمَا أَضَلَّنَا إِلَّا الْمُجْرِمُونَ﴾[1]. واتە: کەس ئێمەی گومڕا نەکرد تاوانباران نەبێت.

ئەی نەفسەکەم کەگومڕابووین لەدوارۆژ پاشان دۆزەخ ئەبێتە شوێنی مانەوەی یەکجارىمان ! ئەوکاتی پەشیمانی و داخ و حەسرەت سوودی نیە بۆمان.

﴿فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[2]. واتە: خۆزگە جارێکی تر بگەڕاینایەتەوە بۆ دونیا ئەوسا چاکەمان دەکرد و ڕێگای ئیسلاممان دەگرتەبەر و باوەڕدار دەبووین.

بەڵێ ئەی نەفسەکەم کە تۆ مردی جارێکی تر گەڕانەوەت بۆنییە بۆئەم دونیایە !

ئەی نەفس کەمێ ڕەحم بە حاڵم بکە بەسە فەرمانم پێ مەکە بۆخراپە ئاخیرەتم وێران مەکە. ئەی نەفس دوورم مەخەوە لەهاوڕێ چاکخوازانی ڕێگای ئیسلام کە بەرەو بەهەشت دەڕۆن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) و یارانی !!

ئەی نەفس کە سەراپای ژیانم تاوان و ئاخیرەتم خراپ بوو لە قیامەت کەس بەهاوارم نایەت ڕزگارم بکات لەسزای خوا !

کەوابوو ئەی نەفسەکەم بابەڵێن بدەین بەخوای گەورە تاکۆتا هەناسەی تەمەن و لە ژیانین بۆ ڕەزامەندی ئەو و بەهەشتی نەبڕاوە تێبکۆشین.

چونکە ئەی نەفسەکەم هەر ئەوەیە چارەسەرمان کە بگەڕێینەوە بۆ لای خوای گەورە و پابەندبوونمان بە ئیسلامەوە ئەوکات سەرفراز و سەربەرزی دونیا و قیامەت ئەبین، بەئیزنی الله تعالی.

---

[1] - سورەتی الشعراء ئایەتی (٩٩).

[2] - سورەتی الشعراء ئایەتی (١٠٢).





# ژیانت چۆن بەڕێ دەکەی.؟

گرنگە بۆ موسـوڵمان بزانێت لەژیانی دونیا چۆن تەمەنی بەڕێ بکات، چونکە بێئاگایە لەوەی تەمەنی زوو ماڵئاوای دەکات، پیری بەرەو ڕووی دێت.

بەڵێ ئەی بەندەی خوا تاکو لەژیانی پێویستە ووریاو ژیرانە ئەو چرکە ساتانەی تەمەنت بۆ خوای گەورە بەسەر ببەی، بەهیوای ئەوەی بەهەشت پاداشتت بێت.

زۆر پێویسـتە موسـوڵمان بزانی چرکە و جوڵانەوەکانی ڕۆژانەی هەسـتان و دانیشـتن و هەنگاوەکانی پێی بۆچی مەبەسـتێکن؟، چونکە تاکە ئامانجێك کە هۆکاری بەختەوەری دونیا و دوارۆژبێت ڕەزامەندیی خوای گەورەیە.

ژیانی دونیا بەخێرای دەڕوات بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەسـت بەخۆی بکات، کەتەمەنی بەرەو پیری هەنگاو دەنێت، لەکاتێکدا نیوەی تەمەنی بەڕێکردووە لەمردن نزیك بۆتەوە، کەچی هەرخەریکی ململانێیە لەگەڵ نەفسـی بۆ بەدەسـتهێنانی شـتە دونیاییەکان، دەیەوێ پارەو پوڵی زۆر کۆبکاتەوە لەخەزێنەکەی، خانوو و شـوقەی چەندین قاتی هەبێ، پلەو پۆسـتی بەرز هیوا و ئاواتییەتی، و حەزبە ناوبانگ و خۆدەرخسـتن دەکات، تاکو خەڵکی بیناسـن و لەبەری هەسـتنەوە تا شـانازی بەخۆییەوە بکات، بەڵام ئەگەر سـەیری موسـوڵمانە پێشـینەکان بکەین کەچ ئاوات و خولیایەکیان هەبووە، چۆن خۆیان شـاردۆتەوە لەوەرگرتنی بەرپرسـیاریەتی دونیا، ویسـتوویانە خۆیان یەکلای بکەنەوە هەتا لەژیانی دونیان بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە.

ئەمەش (سـەعدی کوڕی ئەبو وەقاسـە) هاوەڵی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) و یەکێکیشـە لەو دە کەسـەی موژدەی بەهەشـتی پێدراوە، سـەرکردەی سـوپای موسـوڵمانان بوو لە ڕزگارکردنی عێراق لەدەسـت ئیمپراتۆری فارس، لە سـەردەمی ئەمیری ئیمانداران (عومەری کوری خەتاب) (ڕەزای خوای لێبێت)، حەزی کردووە لەناو ماڵ و منداڵی بژیت، کەس نەی ناسێت و ناوبانگی نەبێت و بەندەیەکی لەخواترسی نهێنی بێت،





خۆی بەدوور دەگرت لەوەی ململانێ بکات لەسەر پۆست و کورسی دەسەڵات، بەڵێ تێگەیشتبوو کە دونیا ژیانێکی کەم و کورتە بۆیە خۆی بەدوور دەگرت، ئەگەر ئارەزووی کردبایە پلەی سەرکردایەتی دەوڵەتی بەدەست دەهێنا، دەی ووت من گەورەی هاوەڵانم و یەکێکم لەوانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی بەهەشتی پێداوم، ئەو سەرکردەیەم کە عێراق لەسەر دەستی من ڕزگار کرا، دەیان بیانووی دەهێناوە بۆ وەرگرتنی ئەمیرایەتی، بەڵام وای نەکرد، بۆیە کوڕەکەی دێتە لای داوا دەکات لەباوکی خۆی بەدوور نەگرێ لەوەرگرتنی ئەمیرایەتی.

(كَانَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ فِي إِبِلِهِ، فَجَاءَهُ ابْنُهُ عُمَرُ، فَلَمَّا رَآهُ سَعْدٌ قَالَ : أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ هَذَا الرَّاكِبِ. فَنَزَلَ، فَقَالَ لَهُ : أَنَزَلْتَ فِي إِبِلِكَ وَغَنَمِكَ، وَتَرَكْتَ النَّاسَ يَتَنَازَعُونَ الْمُلْكَ بَيْنَهُمْ. فَضَرَبَ سَعْدٌ فِي صَدْرِهِ، فَقَالَ : اسْكُتْ، سَمِعْتُ (ﷺ) يَقُولُ : " إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ التَّقِيَّ الْغَنِيَّ الْخَفِيَّ )[1]. واتە: عمری کوڕی هات بۆ لای و پێی ووت: باوکە گیان ئەوە چۆن ڕازی دەبیت وەك عەرەبێکی دەشتەکی خەریکی حوشتر بەخێوکردن و مەڕو ماڵات بیت و خەڵکیش کێشمەکێشمی کورسی و دەسەڵاتیانە؟ هاوەڵی تێگەیشتوو (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس) پێکەنینی دێ بەم وتانە و دەستی دەنێت بەسینگی (عمری) کوڕی و پێی دەڵێت: کوڕی خۆم من لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە فەرموویەتی: خوای گەورە بەندەیەکی لە خواترسی پەنهانی خۆشدەوێت.

بەڵێ ئەمە گرنگترین شتە بۆ بەندەیەك کەتەنها ئامانجی ڕەزامەندیی خوای گەورە بێ باکەس نەی ناسێت لە دونیا، با بێ بەرگ و خۆراك بێت، بەڵام لەگەڵ خوای خۆی ڕاستگۆییە و دەیەوێ بەدڵسۆزی گشت ساتێکی تەمەنی بۆ خزمەتی ئیسلام بێ، بەهیوای ئەوەی لە دوارۆژدا لەدەستەی سەرفرازان بێت.

بەڵام لەم سەردەمە خەڵك زۆربێئاگایەو نازانێ چۆن ژیانی بەڕێ دەکات، خەمی سەرەکی تەنها ئەوەیە بیردەکاتەوە چۆن پارەو پوڵ بەدەست بێنێت،

[1] - (صحيح مسلم، ژمارەی فەرموودە: ٢٩٦٥)




تاکو ژیانی ماڵ و منداڵی بەڕێوەبچێت، بەڵام هیچ خەم و هەوڵێکی بۆ ئەوەنیە خوای گەورە لەخۆی ڕازی بکات، ڕۆژانەی بەســەر دەبات لەگەڵ هاوڕێکانی لەکارێك کە خوای گەورە پێی خۆش نیيە، شــەو تابەیانی خەریکی چات و یاریی ئەلکترۆنییە، لەکاتێکدا خۆی بێ موسوڵمانەو بەتەمای چوونە بەهەشتە بەم شێوەیە ژیانی ڕۆژانەی بەڕێدەکات، بەبێ ئەوەی کاروکردەوەیەکی چاك بۆخوای گەورە ئەنجامبدات.
﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾[1]. واتە: ئەوانە هەر ڕواڵەت لە ژیانی دونیا بەدی دەکەن، لە بەرامبەر قیامەتیشەوە بێ ئاگان.
ئەمەش ژیانی پیاو چاکانی پێشـینی ئوممەتە چۆن نەیان هێشـتووە سـاتێکی کەمیان لێ بڕوات کەناوی خوای گەورەی تێدانەهێنن. (عن عبدالله بن أحمد حنبل قال: (كان أبي أصــير على الناس على الوحدة لم يره أحد الا في المســجد او حضــور جنازة اوعيادة مريض وكان يكره المشي في الاسواق)[2]. واتە: (عبدالله ی کوڕی ئیمام ئەحمدی حەنبەل) دەڵێ: باوکم لەهەموو کەس زیاتر ئارامگر بوو لەســەر تەنیایی، وە هەرگیز هیچ کەس باوکمی نەدیووە بێ هودە و بێ کار چووبێت بۆ جێیەك، مەگەر یان لە مزگەوت بینراوە یان بەدوای جەنازەیەکەوە بووە یان لە ســەردانی نەخۆشــێك بووبێت، گەڕانی بازاڕی زۆر پێ ناخۆش بوو، بەکات کوشتنی زانیووە.
بەڵێ ئەی بەندەی خوا ئەمە ژیانی پیاوچاکانی ئوممەتی ئیســلامە کەچەندین ســەدە تێپەڕیوە بەســەر مردنیان بەڵام ناویان هەر ماوە لەجیهان، هەرکاتێك ناویان دەهێنرێ جیهان شــاهێدی ئەدات چ کەلە پیاوانێکی مەرد بوونە، کە گشــت تەمەنی خۆیان لە پێناو خوای گەورە دانا بوو، بۆیە موســوڵمانان ڕەحمەت و میهرەبانیان بۆ دەنێرن هەتا دونیا ماوە، زانایەکی وەك (ئیبن تەیمیە) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کەتەمەنی هەموو لە عیلم و زانستی ئیسلامی بەسەر برد،

---

[1]- سورەتی الروم ئایەتی (٧).
[2]- صفة الصفوة (١٢٤/٢)





بەبێ ئەوەی خۆشیەك ببینێ چەندان نارەحەتی چێشت لەسەر ئیسلام، لەدوا ووتەی فەرموویەتی: ( وندمتُ على تضــييع أوقاتي في غيرِ معاني القرآن)[1]. واتە: پەشــیمانم لەوەی کە کاتەکانم بەفیرۆ دا لە غەیری تەفسیر و لێکدانەوەی قورئاندا.

ئەگەر مرۆڤی ژیر و خاوەن ویژدان تێبفکرێ کە ئەم زانا موجاهیدە دوای ئەو هەموو خزمەتە کە کردوویەتی بە زمان و قەڵەم و شمشێر، ئینجا دەبێ هێشتا هەر پەشیمان بێ و ئاوات بە خزمەتی زیاتر بخوازێت بۆ خزمەت بە قورئان، کە تاکە مەنهەجی مرۆڤایەتیە و دەڵێ خۆزگە هەموو تەمەنم لەو بوارەدا بەسەر ببردایە! سبحان الله لەو هیممەتبەرزیە کە پیاوانی پێش ئێمە بوویانە!!

زۆربەی ژیانی ئەم کەلە زانا جوامێرە لە زیندانی بەڕێکرد، لەکۆتایی تەمەنیدا لە زیندان نەخۆش کەوت، زانایان دەفەرموون: نەخۆشــیەکەی لەرز و تا بووە (٢٣) ڕۆژی خەیاندووە، جاهەر لە بەندیخانە کۆچی دوایی کردووە، هیچ ژنی نەهێناوە لە ژیانی منداڵێکی نەبوو دوعای بۆبکات، بەڵام ئێســتا هەرکات ناوی دەهێنرێ ڕەحمەتی خودای بۆ دەنێرن، ئەمەش هەمووی فەزڵ و میهرەبانی خوای گەورەیە بۆ بەندەیەکی کە خۆی یەکلای دەکاتەوە لەژیانی دونیا کە گشت تەمەنی بۆ خوای گەورە بێت.

بۆیە ڕەحمەتی خوات لێبێت بزانە ژیانی دونیا ماوەیەکی کەم و کورتە، ئەوەندەی ناهێنێ هەموو غەم و خەفەتێکت بۆ شــتە دونیایەکان بێت، کەســی واهەیە دکتۆرای هەیە لە زانســتی فەلســەفەو ســیاســەت و یاســا نێودەولەتیەکان، یان بەناوبانگترین ئەندازیارە بەڵام هیچ شارەزایەکی نیە بە ئەلف و بێی ئیسلام.

ئەمە هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ﴿ﷺ﴾ (ســەلمانی فارســی) ئامۆژگاری (حوزەیفەی یەمانی) دەکات بەوەی خەریکی زانستێك بێت سوودی هەبێ بۆ دین و دونیاکەی.

[1]- ذيل طبقات الحنابلة"، ابن رجب، (٢/٤٠٢)





(قال سلمان فارسي لحذيفة اليماني: يا أخا بني عبس العلم كثير والعمر قصير فخذ العلم ما تحتاج اليه في أمر دينك ودع ما سواه فلا تعانيه)[1]. واتە: (سەلمانی فارسی) ڕۆژێك دەبینێ وا (حوزەیفەی یەمانی) (خوایان لێ ڕازی بێت) خەریکی زانست دەست خستنە، ئامۆژگاری کرد و پێی فەرموو: ئەی برای هۆزی (عبسی) علیم و زانستەکان زۆر زۆرن، بەڵام لە بەرامبەردا تەمەن زۆر کورتە، بۆیە هەوڵ بدە خۆت بەو زانستەوە خەریك بکە کە سوودی بۆ ئاین و دینداریەکەت هەیە و خۆت بەزانستی ترەوە نارحەت مەکە.

ئایە زانستی دونیایی چ کەڵك و سوودی هەیە تەمەنت لێیەوە بەفیڕۆ بدەی، کەتۆ نەتزانی بنچینەی ئیسلام چیە، و حوکمی دزی و زینا چیە، کە هەر ئیسلامە مایەی بەختەوەری بۆ مرۆڤەکان لە دونیا وادەکات دووربکەویتەوە لەکاری خراپ، و کردنی کاری چاکە کە مایەی سەرفرازییە لە دواڕۆژدا[2].

کەوایە بابگەڕێینەوە بۆ لای خوای گەورە و جیاوازیین لەوکەسانەی تەنها بۆ دونیا ئەژین، با چاو لەکەڵەپیاوانی ئیسلام بکەین تاکو هەر لە دونیا بەختەوەر بژین، با قورئان بکەین بەهاوڕێی ژیانمان ئەگەر بێتاقەت و غەمباری کەس نیە دڵت خۆش بکات برۆ قورئان بخوێنەوە.

بەڵام لەم سەردەمەدا خەڵك ئەوەندە دوورە پەرێزن لەقورئان تەنها مانگی ڕەمەزان دەیخوێنێ، ئەویش بۆ چاوڵێکەری، تاکو بلێت: لە ڕەمەزان ئەوەندە جارە قورئانم ختم کرد، کە ڕەمەزانیش تەواو بوو دواتر پشتی لێدەکات و بەدیواریماڵەوە هەڵیدەواسێت، ئەگەر لێیان بپرسی براکەم خوشکی بەرێزم ڕۆژانە چەن پەڕە قورئان دەخوێنی، لەوەڵامدا دەڵێ: کاتمان نیە لەبەر ئیش و کار بیخوێنین.

---

[1]- صفة الصفوة (١/٢٨٠)

[2]- ئەمە مانای ئەوەنیە کە موسوڵمان وازلەوزانستانە بهێنێ کە دەبنە هۆی خۆشگوزەرانی مرۆڤایەتی، بەڵکو دەبێ لەپێش کافرانەوە موسوڵمانان زانستە دونیایەکان بەرهەم بهێنن وەک لە مێژوی ئیسلامدا دیارە کە زانا موسوڵمانەکان بوونە سەرچاوەی زۆرێک لە زانستەکانی ئەم سەردەمە بۆ زانیاری زیاتر بچۆ کتێبی (هەزارو یەک داهێنان بخوێنەوە) یان کتێبی (ڕۆڵی زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنی زانستدا)




بەڕاستی شەرمە بۆ ئێمەی موسوڵمان کە قورئانمان ئیهمال کردووە، کە خوای گەورە بۆ بەختەوەری مرۆڤەکان ناردوویەتی بەدەستووری ژیان بۆ سەر زەوی، تاکو مرۆڤەکان ڕێگای ڕاست و ئاسوودەی و بەختەوەریی بدۆزنەوە بەهۆی ئەم قورئانەوە دووربن لە گومڕای.

ئەگەر سەیری ژیانی سەلەفی سالّح بکەین (رەحمەتی خودایان لێبێت)چۆن کاتەکانیان لە خزمەت قورئان بردۆتە سەر، بۆیەك ئایەتی قورئان لەشەونوێژ تا بەیانی خەریکی بوونە.

(عن يحيى بن عبدالرحمن قال: سمعت سعيد بن جبير (رحمه الله) يردد هذا الاية ﴿وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ حتى الصبح)[1]. واتە: یەحیای کوڕی عبدالرحمن دەڵێت: گوێم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر بوو (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەم ئایەتەی سوڕەتی یاسینی دووبارە دەکردەوە لە شەونوێژدا تا بەیانی کە دەفەرمووێت: ﴿ وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾[2]. واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا بەتاوانباران دەوترێت: بڕۆنە ئەولاوە و لە موسوڵمانەکان جیاببنەوە هەی تاوانکارەکان.

بەڵێ ئەمانە بۆیەك ئایەت ئەوندە کاتەیان تەرخانکردبوو، بیریان لە ماناو مەبەستەکانی دەکردەوە و کردەوەیان پێدەکرد، بۆیە نەیان دەزانی غەم و خەفەت و ناخۆشی چیە و حوکمی نیوەی سەر زەویان بەهۆی ئەم قورئانەوە کرد.

بۆیە ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەی بەندەی خوا باهەوڵدەین کاتەکانمان هەروا بە ئاسانی بەهەدەر نەچێت، ڕۆژانە بەردەوام بادەوری قورئان بکەینەوە گەر بەلایەنی کەم ڕۆژێ یەك پەڕیش بێت بابیخوێنینەوە، بەڵام دانەبڕین واتە تەنها بۆمانگی رەمەزان دەوری بکەینەوە، بەڵکو هەموو ڕۆژێك دەوری بکەینەوە یەك ئایەتیش کەم نیە تاکو لە دوارۆژ قورئان شەفاعەتمان بۆبکات.

---

[1]- صفة الصفوة (٢/٥٠).

[2]- سورەتی یس ئایەتی (٥٩).





هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی. (اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ)[1]. واتە: قورئان بخوێنن چونکە لەرۆژی دوایی دا تکاکارە بۆ خاوەنەکانی.

بەڵێ خوێنەری بەرێز: باهەموو کات هەوڵدەین زیکر و یادی خوا لە دڵمان بێت، بۆ ساتێکی کەمیش دڵمان غافل و بێئاگا نەبێت بەهۆی خۆشی و مەبەستەکانی دونیا، با هەمووکات بیرمان لای خوای گەورە بێ، تاوەکو لای خوای گەورە خۆشەویست بین.

﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[2]. واتە: ئەوانەی یادی خوا دەکەن لەکاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان ڕاکشاوون لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەوزاتە فەرامۆش ناکەن، هەمیشە بیردەکەنەوە لە دروست بوونی ئاسمانەکان و زەوی بیردەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەک، سەرنجی هەموو دیاردەیەک دەدەن، سەرئەنجام دەڵێن: پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروست کراوانەت بێ هودە و بێ ئامانج دروست نەکردووە، پاکی و بێگەردیی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ.

بۆیە رەحمەتی خوات لێبێت گەر بەتەنها بووین، لەرێگابووین، لەکارو کاسبی بووین، یان لەهەر کاتێکدا بووین با یاد و زیکری خوای گەورە لەسەر زمانمان بێت، لەگەڵ هاوڕێکانت بووی باسی دونیا و ڕابواردونیان دەکرد، تۆ لەو کات لەدڵی خۆت زیکری خوا بکە، لا الە الا اللە، الحمدللە، استغفراللە، اللە أکبر، سەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدە، ئەمە نیشانەی تەقوایە مەهێڵە پەشیمان بی لە دوواڕۆژ لەبەرامبەر ئەوکاتانەی لێت ڕۆیشتن کە یاد و زیکری خوای گەورەت نەکردووە.

---

[1] - رواه مسلم رقم الحديث: (٨٠٤).

[2] - سورەتی ال عمران ئایەتی (١٩١).





کەوایە تاکو لە ژیانی فرسەتە بۆت کارو کردەوەیی چاکە بەرێ بکەی بۆ دوواڕۆژت، بەکردنی هەر کارێکی باش کە ڕەزامەندی خوای گەورەی لەسەر بێت تۆپاداشت دەدرێتەوە لە دوواڕۆژ، بۆیە تەمبەڵی مەنوێنە لەکردنی کاری باش و یەك چرکە چیە لەژیانت مەی فەوتێنە گەر بۆخوای گەورە نەبێ، چونکە گەر تۆ ئیسلام بەرنامەت بوو، هەرکارێك بکەی لە دونیا بەخێر بۆت حساب دەکرێت لای خوای گەورە، یارمەتی دانی مامە حاجی بەساڵاچوو ڕێزگرتن لێی، لابردنی تەنگ و چەلەمە لەسەر ڕێگە، بەخشین و یارمەتی دانی هەژار هەتا بە زەردەخەنەیەکیش بێ، ناشتنی دار لەمزگەوت یان هەر شوێنێك،ئەمانەو سەدان کاری تری چاکە لەدونیا گشتی لەسەری پاداشتت دەدرێتەوە لە دواڕۆژ، بۆیە بۆکردنی کاری چاکە موشتەریەکی باش بە تاکو لەقیامەت بۆخۆت سەربەرز بیت.

(عن محمد بن اسحاق الموصلي قال: قال أبو حازم (رحمةالله) ان بضاعة الاخرة كاسدة فاستكثروا في أو ان كسادها فانه لو جاء يوم نفاقها لم تصل منها لا بقليل ولا الى كثير)[1]. واتە: محمد کوری ئیسحاقی موسلی دەڵێ: ئەبو حازم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: کاڵا و شت و مەکی قیامەت لە دونیا هەرزانە و بێ نرخە و مشتەری و کڕیاری کەمە، هەتا دەتوانن ئێوە زۆری لێ بکڕن و زۆری لێ کۆبکەنەوە تا هەرزانە، ئەگینا ڕۆژی قیامەت هات لەوێ پارەی چاك دەکات بەڵام هەرچیت لە دونیا نەکڕیێ لەوێ نەزۆر و نەکەم هیچت دەست ناکەوێت.

بەڵێ بەندەی خوا دونیا شوێنی تاقیکردنەوەیە و دواڕۆژیش شوێنی دانەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوەی دونیایە، ئەو کات ناتوانی تاقیکردنەوە و کاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدەی، پابەند بوونت بە ئیسلام و دەستگرتن بە قورئان و سوننەت پاشان جێبەجێ کردنیان واتە بەڕێکردنی کاروکردەوەی چاکەیە بۆ دوای مردنت، کەسوودی دەبێت بۆت لە ڕزگارکردنت لە ئاگری دۆزەخ.

---

[1] - صفة الصفوة (٢/٢٣١).





بۆیە کەتۆ بڕیارتداوە ژیانی خۆت گشت ساتێکی بۆ خوای گەورە بێت، غەم مەخۆ بە دونیا پەرستان هەڵمەخەڵەتێ ئەوانەی ژیانی ئاخیرەتیان فرۆشتووە بە خۆشییەکی کەمی دونیایی، یان ژیانێکی خۆشیان هەیە، سەیارەو خانووی بەرز و ژن و منداڵی زۆریان هەیە، بەردەوام لەخۆشی و ڕابواردن و گەڕانن لە سەیرانگا و دەچن بۆ شوێنە گەشتیاری دەوڵەتان بەکەیفی خۆیان دەسووڕێنەوە.

بەڵام پشتیان لەبەرنامەی ئیسلام کردووە، زۆر ئاگاداری خۆت بە غەمیان پێ مەخۆ،کەتۆش ژیانت بەشێوەی ئەوان نیە، بەردەوام لەنەبوونی و ناخۆشیدای، بەڵام ئیمانێکی پتەوت هەیە دڵ خۆشبە و پێیان هەڵمەخەڵەتێ.

﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي الْبِلَادِ﴾[1]. واتە: لەخشتەت نەبات هەڵتنەخەڵتێنێ ئەوانەی کوفریان کردووە و ڕوویان لەدونیایە.

بەڵێ ئەی بەندەی خوا هەردەم بیرت بالای دواڕۆژ بێت و هەموو هەوڵت بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەبێت، چونکە ئەو کەسانەی بەدوای دونیا کەوتوونە خۆشییەکی کەمیان بۆ هەیە لە ژیان، کەزوو تەواو دەبێت و خۆشیەکەیان بەردەوام و تا سەر نیە.

بێئاگان زوو تەمەنیان بەسەر دەچێت و پیری بەرۆکیان دەگرێت، دەکەونە نەخۆشی و ئازار کە گشت خۆشییەکانیان بیر دەباتەوە، پاشان لەقیامەتیش شەرمەزار و سەرشۆڕن بەهۆی پشتکردنیان لە بەرنامەی خودای گەورە کەئیسلامە.

---

[1] - سورەتی ال عمران ئایەتی (١٩٦).





﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴾[1]. واتە: ڕۆژێک دێت ئەوانەی کەبێ بڕوان بەرەو دۆزەخ دەبرێن و نیشانیان دەدرێت و پێیان دەوترێت: هەرچی خۆشی و شادیەکتان هەبوو لەژیانی دونیاتاندا بەئارەزووی خۆتان ڕاتانبوارد، کەوابوو ئەمرۆ ئیتر نۆرەی ئەوەیە کەسزای خەجاڵەتی و ڕیسوایی بدرێنەوە، بەهۆی ئەوەی کەلووت بەرزیتان دەکرد لەزەویدا بەناحەق و بەهۆی دەرچوونتان لەسنوور و فەرمانی خوا.

بەڵام ئەوانەی لەخوا ترسان و پشتیان لەدونیا کردوو بۆ قیامەت هەوڵ و کۆششیان کرد ئەوا بەهەشتانێکیان بۆ هەیە کەچەندەها ڕووباریان بەژێردا دەڕوات و بەنەمری تیایدا دەمێنەوە.

﴿أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[2] واتە: هەر ئەوانن نیشتەجێی بەهەشتن و تیایداژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر.

بۆیە ئەی بەندەی خودا تاکو نەمردووی لە ژیانی بەڵێن بەخودای گەورە بدە گشت جولەو کردارێکت بۆ ڕەزامەندی ئەوبێت تاکو لە دوارۆژدا ببنە خاوەنی بەهەشتی پڕ لەناز و نیعمەت، بە ئیزنی الله تعالی.



[1] - سورەتی الاحقاف ئایەتی (٢٠).

[2] - سورەتی البقرة ئایەتی (٨٢).





# داڕووخانی کۆمەڵگە

یەکێك لەو کردەوانەی دینی ئیسلام گرنگی زۆری پێداوە، بریتییە لە ئەمر کردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە. موسوڵمانی ژیر ئەو کەسەیە لە هەر شوێنك بوو،ماڵەوە، زانکۆ، بازاڕ، تۆوی چاکەو ئیحسان بڵاودەکاتەوە، فەرمان بە موسوڵمانان دەکات لەوەی فێربووە لە قورئان و سوننەتەکانی خۆشەویستمان پێغەمبەری خوا (ﷺ) جێبەجێی بکەن، وە هەوڵی بنەبڕکردن و قرتاندنی ڕەگی تاوان و خراپە دەدات، چونکە زانیویەتی نەگۆڕینی خراپە بۆ چاکە نیشانەی لاوازی ئیمانە، بۆیە هەمیشە و هەمووکات ئەمر دەکات بەچاکە و ڕێگری دەکات لە خراپە. ( عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ سَمِعْت رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ)[1]. واتە: لە (ئەبی سەعیدی خودریەوە) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کە گوێم لە پێغەمبەری خودا بووە (ﷺ) کە فەرموویەتی: هەریەکێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی ئەوا با بەدەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی ئەوا با بە زمانی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی ئەوا با لە دڵییدا نەهی لێبکات ( حەز بەو خراپە نەکات) وئەمەش لاوازترینی ئیمان وباوەڕە.

ئەی بەندەی خودا ڕەحمەتی خوات لێبێت بزانە تۆی موسوڵمانی خاوەن دین و بەرنامەیەکی، قبوڵی هیچ زوڵم و ستەم و غەدر و ناپاکیەك ناکات لەکۆمەڵگا، دەبێ گشت تاوان و کردەوە خراپەکان بگۆڕدرێ بە چاکە سۆز و میهرەبانی، تا بەختەوەری و ئارامی باڵبکێشێ بەسەر کۆمەڵگا، ئەمەش نایەتە دێ، تەنها بە وەنەبێ ئەمربکەین بە چاکەو ڕێگری بکەین لە خراپە، ئەوکاتە خۆشی و بەختەوەری ڕوومان تێدەکات، خوای گەورە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی دەبارێنێت بەسەرمان،

[1] -(رواه مسلم، ژمارەی فەرموودە: (٤٩).





چونکه بەرنامەکەی کە ئیسلامە جێبەجێ دەکەین گوێڕایەڵی گشت چاکە و خراپەیەکی خوای گەورەین، بۆئەوەی کۆمەڵگایەکی بەختەوەر و سەرکەوتوومان هەبێت، چونکە کەس تاوان و خراپە ناکات ڕقی بەرامبەر برا موسوڵمانەکەی نیە، چی پێخۆشە بۆ خۆی زیاتری پێخۆشترە بۆ برا ئیمانداره‌کەی، نەخۆشە سەردانی دەکات، پێویستییەکی هەیە بۆی جێبەجێ دەکات، ڕزق و ڕۆزی پارەی هەیە دەیبەخشێ بە نەدارەکان، غەدر و ناپاکی دەکات بەرامبەر برا موسوڵمانەکەی ترسی خوای بیردێتەوە دواتر پەشیمان دەبێتەوەو داوای لێبوردن و گەردن ئازای لێ دەکات.

ئەو کات کۆمەڵگا پێویستی بە لێپرسینەوە و قازی و دادوەر نابێ بەشێوەیەکی بەرچاو بۆ کێشەو گرفتەکانی خەڵکی، ئەگەر کۆمەڵگا بەڕاستی پابەندی فەرمانەکانی ئیسلام بێت کە بەرنامەی خوای گەورەیە.

﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[1]. واتە: ئاخر بۆ بیرناکەنەوە کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و دادپەروەرو چاك و بەجێ بێت، بەتایبەت لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

سەیربکە و بیربکەرەوە ئەی بەندەی خوا ئەمە هەمووی لە سەرەنجامی فەرمانکردنە بە چاکە و تەسلیم بوونە بۆ فەرمانی خوای کارزان، بەڵام گەر خراپە و تاوان زۆر بوو لە کۆمەڵگا کەس هەوڵی گۆڕینی نەدا، ئەوە توڕەیی و عەزابی خوای گەورە بەسەر کۆمەڵگا دەبارێ، چونکە زوڵم و ستەم ڕق و کینە بڵاو بۆتەوە، دووڕوو و دڵ نەخۆشی سەری هەڵداوە لە نێو موسوڵمانان، حەسوودی و ئێرەی بردن بە ماڵی یەکتر، نەمانی شەرم و ئابڕو و بێڕەوشتی بڵاوبۆتەوە، داوێن پیسی باڵی کێشاوە بەسەر کۆمەڵگادا، دەست درێژی دەکرێتە سەر شەرەف و ناموسی یەکتری!، ئەوکات خوای گەورە قبوڵی ناکات عەزابی ئەبارێنێ بە لە ناوبردنی ئەو نەتەوە و گەلە جا بەهەر جۆرە سزایەك بێت.

---

[1] - سورەتی المائدة ئایەتی (٥٠).





پێغەمبەری خۆشەویست ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ: (والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَتَأْمُرُنَّ بالْمَعْرُوفِ، ولَتَنْهَوُنَّ عَنِ المُنْكَرِ، أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّه أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْهُ، ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلا يُسْتَجابُ لَكُمْ )[1]. واتە: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە دەبێت فەرمان بکەن بە چاکەو قەدەغەش بکەن لە خراپە، ئەگەر نا ! نزیکە خوای گەورە بەلا و سزایەک دابەزێنێت بەسەرتاندا، ئەوکات دوعاش بکەن وەلامتان ناداتەوە .

بەڵێ ئێستا ئەو ڕۆژگارەیە کە تێداین پڕیەتی لە تاوان و فیتنەو دژایەتیکردنی دین و نەمانی شەرم و حەیا لەلایەن ئافرەتان و پیاوانەوە و دوورکەوتنەوەی موسوڵمانان لەبەرنامەی خوای گەورە، بۆیە هیچ دوعاو پاڕانەوەمان گیرا نابێت، بەهۆی ئەوەی لەناو تاوان غەرق بووینە، حاڵمان بەو شێوەیە ناخۆشە پڕیەتی لەدەردەسەری و نەهامەتی، هەمووشی بەهۆی تاوانەکانمانەوەیە، خوای گەورەش ئەو حاڵ و ناخۆشیەمان ناگۆڕێت هەتا نەگەڕێینەوە سەر ڕێگای ڕاست کە ئیسلامە.

﴿ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾[2]. واتە: بێگومان خوا بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێك ناگۆڕێت (لە خۆشیەوە بۆ ناخۆشی، یان لە زەلیلیەوە بۆ سەربەرزی، یان لە گرانیەوە بۆ هەرزانی) هەتا ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن.

ئەم ڕۆژگارەی ئێستا ئاوایە موسوڵمان دەبینی دەڵێ کێشەم هەیە، یا ئاواتێکم هەیە یان دڵم بەردەوام توندە، یان نەخۆشییەکم هەیە، یان دەڵێ پیاوەکەم یان ژنەکەم هەموو کات زۆر خراپە لەگەڵم، یان چەند دوعا دەکەم ئەو کچە یان ئەو کوڕە ببێتە قسمەتم کەچی وا تەمەنم بەرەو پیری دەڕوا کەچی دوعام قبوڵ نیە، یان خوشکی وا هەیە دەڵێ چەندین کوڕ هاتوونەتە داوام نوێژی ئیستخارە دەکەم دوعا دەکەم هیچ ئەو کوڕانە ناکەونە بەر دڵم، یان زۆر هۆکارو کێشەو گرفتی تر خەڵکی پێیەوە دەناڵێنێ.

[1]- ( سنن الترمذي، ژمارەی فەرموودە: (٢١٦٩). وصححه الألباني في صحيح الجامع، ژمارەی فەرموودە: (٢٣٩٩) .
[2]- سورەتی الرعد ئایەتی (١١).

ئەمەش هەمووی سەرەنجامی خراپە و تاوانە کە موسوڵمانان بەگشتی لە هەموو لایەکەوە تێکەوتوونە، هەوڵی گۆڕینی نادەن هەروەك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئاماژەی پێکردووە، وەك لە پێشەوە باسمان لە فەرموودەکەی کردووە، موسوڵمان زۆر بەکەمی دوعایان گیرادەبێت!، چونکە لە کاتێکدا دەبینێت خێزانی، دایکی، خوشکی، کچی، سفورە و فەرمانی خوای گەورەی پێشیلکردووە، لە دەرەوە و شوێنەگشتیەکان وەك بووکەشووشە خۆی ڕازاندۆتەوە بە ناشەرعی، ویژدانی نایگرێت ئامۆژگاریان بکات، پێیان بڵێت: دایکە، کچم، خوشکم، هاوسەرەکەم، لە خودا بترسن و ئێوە سنوری خواتان بەزاندووە، ئەمە خراپەیە ئەیبینێ کەچی نایگۆڕێ، یان کاتێك موسوڵمان دەڕوات بۆ ماڵەوە فلیمی دوور لەڕەوشتی ئیسلامی و کلتوری کوردی و ناشەرعی لەسەر تیڤیەکەیەتی، کە ڤایرۆسی یەکجار خراپ و وێرانکەرە بۆ ئەندامانی ماڵەوەو خێزان و کۆمەڵگا دائەرووخێنێت، چونکە کاریگەری زۆری هەیە لەسەر ئەخلاق و ڕەوشت، هەمووی لەسەر خۆشەویستی و پەیوەندی ناشەرعی نێوان کوڕان و کچانە، لەپاش ئەوەش ئەکتەرەکانی هەمووی پۆشاکی ڕوت و نیمچە ڕوتیان لەبەرە، بەڕاستی ئەوە کارەسات و ماڵوێرانیە بۆ خێزان.

جا موسوڵمان چۆن قبوڵی بکات ئەو خراپەیە لەناو ماڵەوەی بێت نابێ بێدەنگ بێ دەبێت هەوڵی گۆڕینی بدات، موسوڵمانی وا هەیە پێنج کوڕی هەیە، مزگەوت لەنزیك ماڵیەتی خۆی دەڕوات بۆ نوێژی جەماعەت، فەرمان بە کوڕەکانی ناکات ئەوانیش لە مزگەوت نوێژەکانیان ئەنجام بدەن. تەنانەت دایك و باوکی واهەیە کاتێك کوڕەکەیان بچێتە مزگەوت زیاتر لێی دەپێچنەوە!، کەچی بە پێچەوانەوە گەر کوڕەکانی بەردەوام خەریکی یاری دۆمینە و تۆپی پێ و چوونە دەرەوەبن تا نیوە شەو، زمانی نایگرێ ئامۆژگاریان بکات، بەڕاستی ئەی بەندەی خوا بزانە ئەم ڕۆژگارەی تیایدان کەوتووینەتە خراپترین سەردەم و ڕۆژگار تەنها خوای گەورە ڕەحم بکات بەحاڵمان.




گەر هەریەکەمان لەلای خۆمانەوە ڕێگری لە بڵاوکردنەوەی خراپە و تاوان نەکەین ئێمەش توشی سزای خودای گەورە دەبین، پەنادەگرین لەسزای خودا، بەڵام بەداخەوە کەسانێك هەن لەڕاستی ئەم حەقیقەتە تێنەگەیشتوونە، کاتێك هەوڵی گۆڕینی خراپەیەك ئەدەی بۆ چاکە، دێنە دەنگ دەڵێن وازبێنە، خەڵك ئازادە باخۆی ڕوت بکاتەوە لەسەر جادە، کە دایك و باوك و پیاوەکەی ڕازین تۆ چیت داوە لێی هیچ ئیشت پێی نەبێت، هەموو کەس ئارەزووی خۆیەتی چی دەکات بابیکات!

یان گاڵتە و ئیهانە دەکەن بە ئیسلام و قسە بەڕیش و عەبا و سوننەتەکانی پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ دەڵێن، کاتێك بتەوێ لەسەر ئیسلام بەجواب بێیت، پێت دەڵێن: وازبێنە کڵاوەکەت بگرە تاکو با نەیبات، تۆچیت داوە لە ڕیش بۆخۆت دانیشە، بۆیە پێغەمبەری خەمخۆرمان﴿ﷺ﴾ لەو بارەیەوە زۆر جوان نمونەی بۆ باسکردووین، ئەگەر هاتوو هەوڵی گۆڕینی خراپە نەدەین، هەموو خەڵکی گشتی لەناو دەچن و دەکەونە بەر تورەیی و سزای خودای گەورە، پەنا بە خوای گەورە لە توڕەبوونی.

با بچینە خزمەت هاوەڵی ئازیز (نوعمانی کوڕی بەشیر) (ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەری ئازیز ﴿ﷺ﴾ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

(مَثَلُ القَائِمِ فِي حُدودِ اللَّه، والْوَاقِعِ فِيهَا كَمَثَلِ قَومٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سفينةٍ، فصارَ بعضُهم أعلاهَا، وبعضُهم أسفلَها، وكانَ الذينَ فِي أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مِنَ الماءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ، فَقَالُوا: لَوْ أَنَّا خَرَقْنَا فِي نَصيبِنا خَرْقًا وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا. فَإِنْ تَرَكُوهُمْ وَمَا أَرادُوا هَلَكُوا جَمِيعًا، وإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِم نَجَوْا ونَجَوْا جَمِيعً)[1]. واتە: نمونەی ئەو کەسەی کە خۆپارێزەری سنوری قەدەغەکراوەکانە، وە ئەوەی کە سنورەکەی بەزاندووەو تێپەڕاندووە، وەك کۆمەڵێك وان کە لەسەر پاپۆڕێك بن کە دوو قات بێت،

[1]- (أخرجه البخاري في صحيحه، كتاب الشركة، باب هل يقرع في القسمة والاستهام فيه، (٣/ ١٣٩)، ژمارەی فەرموودە: (٢٤٩٣).





لەناو خۆیاندا تیرو پشك ڕابکێشن، هەندێکیان لەسەرەوە بن وهەندێکیان لە خوارەوە، ئەوانەی لەخوارەوە بوون ئەگەر ئاویان بویستایە ئەهاتنە سەرەوە ئاویان دەبرد، لەناو خۆیاندا گوتیان: ئەگەر بێت و ئێمە لەبەشەکەی خۆمان لەژێرەوە پاپۆڕەکە کون بکەین بۆ ئەوەی ئەوانەی سەرەوە ئەزیەت نەدەین باشترە، لەو کاتەدا ئەگەر ئەوانەی سەرەوە وازیان لێ بهێنن بۆ ئەوەی پاپۆڕەکە کون بکەن هەموویان ئەخنکێن، وە ئەگەر دەستیان بگرن هەموویان ڕزگاریان دەبێت.

بەڵێ ئەگەر هەر وەکو ئەوانەی ناو پاپۆڕەکە دەستی نەفامەکان نەگرین و ڕێنمونیان نەکەین بۆ چاکەکاری وازهێنان لە خراپە، ئەوە پاپۆڕەکە نوقم دەبێت، هەرچی لەسەریێتی بە چاك و خراپەوە غەرق دەبێت و ڕۆدەچێت.

بۆیە ئەوانەی کە دەڵێن لەماڵی خۆتان دینداری بکەن و کڵاوی خۆتان بگرن با نەیبا، دەبێ بیزانن دەبێتە بەهیلاك چوونی ئەوانیش زاڵ بوونی خراپە کە دەبێتە لەناو چوونی گشت کومەڵگا، بەڕاستی ئەم ئوممەتە ناگەڕێتەوە بۆ چاکەکاری وچاك سازی و خۆشگوزەرانی، وە لەش ساغی بۆ ناگەڕێتەوە تا نەگەڕێتەوە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی پەروەردگاریان، ئەویش بە فەرمان کردن بەچاکە و نارەزایی دەربڕین لە خراپە.

بۆیە با هەموومان لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورە ئەمر بکەین بەچاکە ڕێگربین لە خراپە،﴿وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[1]. واتە: پێویستە لە ئێوە ئوممەتێک پێک بێت، یاخود با هەمووتان ئوممەتێک بن کە بانگەواز بکەن بۆ خێرو چاکە، فەرمان بدەن بەهەموو کارێکی باش و دروست، قەدەغەو ڕێگری هەموو نادروستیەک بکەن، ئا ئەوانە هەر سەرکەوتو سەرفرازن.

[1]- سورەتی ال عمران ئایەتی (١٠٤).





بەڵێ ئەوکات خێروخۆشی لەناو موسڵمانان بڵاودەبێتەوە بەڕێگری کردن لەخراپە و تاوان و کاری نابەجێ، بەلام گەر وامان نەکرد ناخۆشی و دووبەرەکی ڕق و کینە، نەبوونی ووشکە سالی ئەکەوێتە نێوانمان.

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[1].

واتە: وە ئەگەر خەڵکی شارو دێیەکان ئیمان بێنن وە تەقوای خوای گەورە بکەنو خۆیان بپارێزن لە تاوان ئەوە بەرەکەتی خۆمانیان بۆ ئەکەینەوە لە ئاسمانەوە بە باران بارین وە لە زەویشەوە بە ڕووەك و دانەوێڵەو جۆرەها بەرووبووم و خێرو خێرات بەڵام ئەوان پێغەمبەران و ئایەتەکانی خوای گەورەیان بە درۆزانیو ئیمانیان پێ نەهێنا بۆیە سزامان دان و بردماننەوە بەهۆی کوفرو تاوانو کردەوەی خراپیانەوە.

بۆیە با هەوڵ بدەین لەو ئیماندارانە بین کە ئەمر بەچاکە و ڕێگری خراپە دەکەن لە هەموو کات و ساتێکدا، لە خۆشی و ناخۆشی، سەرماو گەرما، هەبوونی و نەبوونی.

هەروەك خودای پەروەرگار لە بارەی باوەڕداران دەفەرمووێ: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾[2]. واتە: باوەڕدارانی پیاو و ئافرەت هەندێکیان دۆستو خۆشەویستو سەرخەری هەندێکی تریانن فەرمان ئەکەن بەچاکەو ڕێگری ئەکەن لە خراپە.

بەڵێ با بەیەکەوە هەموومان بەنیەتێکی پاك و دڵسۆزانە بۆ گەڕانەوە بۆ خۆشی و بەختەوەری لە ژێر سێبەری بەرنامەی ئیسلام،

---

[1]- سورەتی الاعراف ئایەتی (٩٦).

[2]- سورەتی التوبة ئایەتی (٧١).





ئەمر بە چاکەکردن و ڕێگری لە خراپەکاری و ناحەزانی ئیسلام بگرین،کەدەیانەوێ موسوڵمان لەڕەگ و ڕیشاڵی ئیسلام داماڵن و دووریان خەنەوە لەڕێگای خوا، بۆیە ڕێگربە لەبڵاوبوونەوەی تاوان تاوەکو بگەین بە پەیمان و بەڵێنی خوای گەورە  کە بە ئیماندارە ڕاستگۆکانی داوە  بەهەشت و نازو نیعمەتەکەیەتی.

﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾[1].

واتە: خوای گەورە بەڵێنی داوە بە باوەڕدارانی پیاو و ئافرەت بەوەی کە ئەیان خاتە بەهەشتەوە کە پڕە لە باخ، وە جۆگەلە ئاو بە ژێر دارو ماڵەکانیاندا ئەڕوات بە هەمیشەیی‌و نەمری تیایدا ئەمێننەوە وە خانوو کۆشك‌و تەلاری باش‌و پاکیان پێ ئەدات کە لە زێڕو زیوە لەناو بەهەشتێك کە شوێنی مانەوەی هەمیشەییە، وە خوای گەورەش لێیان ڕازی ئەبێت، کە ئەم ڕەزامەندیەی خوای گەورە لە هەموو ئەو نازو نیعمەتانە گەورەترە کە خوای گەورە بە بەهەشتیەکانی ئەبەخشێ ئا ئەمە بردنەوەی هەرە گەورەیە کە مرۆڤ بچێتە ناو بەهەشتەوەو خوای گەورە لێی ڕازی بێت.

بۆیە باهەوڵی بۆ بدەین چونکە بەهەشت بەئاسانی بەدەست نایەت، بەڵکو ماندوو بوون و ئازار و میحنەتی دەوێت، ئینجا با لە ئێستاوە بکەینە کردار تاکو نەمردووین گشت هەوڵێکمان بۆ بڵاوکردنەوەی دینی خوای گەورە بێ، پاشان ڕێگەگرتن لە کاری نابەجی و دژی بەرنامەی خوابێ تا لەکۆتایی بەهەشتی پڕ لەنازو نیعمەت شوێنی هەمیشەیمان بێت.

[1]- سورەتی التوبة ئایەتی (٧١).





# ستەم کردن لە خێزان

ستەم کردن لەم ڕۆژگارەی غوربەتی ئیسلام بە چاوی سەر ئەی بینین کە هەموو کاروباری ژیانی گرتۆتەوە، یەکێك لەو ستەم و زووڵمانەی کە لەم سەردەمە زۆر گوێ بیستی ئەبین و ئەیبیستین ئەوەیە دەڵێن: فڵانە پیاو زۆر دڵ ڕەق و بێ ڕەحمە، یان زۆر بێ ویژدان و خەم ساردو بێ وەفایە، یان زۆر توڕەیە و قسەی خۆش نیە بەرامبەر بە هاوسەر و هاوژینی ، یان گوێداری دایك و خوشکەکانیەتی دژی هاوسەری ئیهمالی دەکا گوێی پێ نادات، یا دەڵێن فلانە پیاو زۆر بێ ڕێزە بەرامبەر خیزانەکەی هەمیشە لە نێو مەجلیس و لای میوان و لە نێو خەڵکی قسەی ناخۆش و سووك و بێ ڕێزی پێ دەڵێ، یان لەسەر شتێکی زۆر کەم و سادە لێی زیزو توڕە دەبێت بۆ ماوەی مانگ و دوومانگ قسەی لەگەڵ ناکات.

یان زۆرێك پیاو هەن لەپێناو خێزانی دووەم خراپە بەرامبەر خێزانی یەکەم دەکەن، ئیهمالیان دەکەن و دەیان نێرنەوە ماڵی باوکیان، خوشکێك گوتی: براکەم پیاوم سەدان و وەعد و بەڵێنی پێدام تاکو ڕازیبم لەگەڵی بژیم بۆ زەواج، دواتر بۆماوەیی نۆ ساڵ پێکەوە بووین قسمەتی خوا منداڵمان نەبوو، گوتم: پیاوەکە، ڕازیم ژنی تربێنە بەپێی شەرع گەر منداڵت دەوێت، گوتی: ژنی دووەمی دیاری کرد، منیش لەگەڵی چووم بۆ مارەیی و شت کرین بۆ ژنەکەی، دوای چەن مانگێك منی ناردەوە ماڵی باوکم منەتی پێم نەماوە، دەڵێ تەڵاقت دەدەم.

بەڕاستی کاتێك موسوڵمان گوێبیستی خراپەی ئەو پیاوانە دەبێت خۆی پێناگیرێ غەم و خەفەت ئەخوات لە دڵەوە بۆ ئەو جۆرە خوشکە ئیماندارانە، کەسی ڕاستگۆی شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەوکەسەیە ئاوات بەخۆشی و بەختەوەری ژیانی گشت خێزانی بڕواداران بخوازێت.

زۆر بەداخەوە بۆ ئەو پیاوە بەناو موسوڵمانەی کە ئەو ڕەفتارو ئاکارو ڕەوشتە نزمەی هەیە، بەرامبەر بە خێزان و هاوژینی بەرێزیان، ئەو هاوسەرەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لە دواساتەکانی ژیانی لەسەرە مەرگا وەسیەت و ئامۆژگاری بۆ موسوڵمان ئەوە بوو داوای لە پیاوان کرد لەگەڵ خێزانەکانیان باشبن ئەوان ئەمانەتن لاتان.

ئەی ئەو پیاوانەی خراپ و بێ ویژدانن بەرامبەر خێزانەکانتان لە خوای گەورە بترسن، سوێندبێ بە خوای پەروەردگار ئەو زوڵم و ستەمەی ئەیکەن خوای گەورە لێتان قبوڵ ناکات، ویژدان قبوڵ ناکا تۆی دڵ ڕەق ئاوا خراپ بی بەرامبەر هاوژینت، بەڕاستی زۆر گوناهو بەستەزمانە لە پێناو تۆ دایك و باوکی جێهشتوە تا ژیان بەیەکەوە ببەنە سەر، زۆر حەیفە بۆتۆ کە خراپ ئەجوڵێیتەوە بەرامبەر خێزانت تۆ چاکەو ماندوو بوون و غەم و میحنەتی ئەوت لەبیر کردووە لە پێناو خۆشیەکانت، کە شەو و ڕۆژ چەن ماندوو هیلاك و شەکەتە بە خزمەتکردنی تۆو مناڵ و میوانەکان، ئیسلامەکەمان قبوڵی ناکات ستەم لە هاوسەران بکرێت، دەبێ موسوڵمان بە جوانترین شێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات، بە جۆرێك دڵی ڕابگرێت خێزانەکەی دڵ خۆش و شادوومان بێت، هەمیشە لێی نزیك بێ و ئاگای لە کێشەو داخوازییەکانی بێت، نەك بە جۆرێك ئیهمالی بکات بۆ ساتێکش لەگەڵی دانەنیشێت و چایەکی لەگەڵ بخواتەوە.

لە بەیانی تا نیوەی شەو بچیتە دەرەوە لەکاتێکدا بێیتەوە ماڵ خێزانەکەت خەوتوە لەخەو هەڵی بسێنیەوە بۆ داخوازیەکەت!

ئایا تاوان نیە بۆ تۆ نیوەی شەو بێیتەوە بە زۆر ئەو بەستەزمانە هەڵ بسێنی و خۆشی خۆت بەتاڵ بکەیت لەگەڵی کەچی ئاگات نە لە ماڵ و نەلەمناڵ بێت نەهەستی خێزانەکەت ڕادەگریت؟، تاوەکو بزانی چیان پێویستە بۆ خواردن چ کەم و کوڕیان هەیە، لێی بپرسی ئایە ئەم ڕۆژەی چۆن بەسەربردووە.

بەڕاستی زۆربەی پیاوانی ئەم سەردەمە حەق و مافی ئافرەت پێشێل دەکەن و دەیان چەوسێنەوە وەکو کۆیلە دەبێ لە ژێر دەستیان بن،





لە لای میوان لای خزم لای هەموو کەس بەقسەو شێوەیەکی زۆر ناخۆش و ڕەق و ناشرین گەر پێویستیان بە خواردنێك یان ئاو یان هەر پێداویستیەکی تر بێت بە جوێن و ناوو نازناوی ناشرین (سەرگەورە، ئەی سەر درێژ، ئەی کورتە بالا، ئەی پیرەژن) ئەمانەو چەندان قسەی ناشرین تر بانگیان دەکەن.

گەر ئافرەتەکەش بەجواب بێت لەسەر جوێنەکانی دەبێ بچێتەوە ماڵی باوکی، زۆر ئافرەتی موسوڵمان هەن دەڵین: گەر لەبەر خاتری دایك و باوك و مناڵەکانم نەبێ لە لای ئەو پیاوە نامێنمەوە.

زۆر بەداخەوە بۆ ئەو پیاوانەی کە سەرەتا بۆ ڕازیکردنی ئافرەتەکە چەندان قسەی درۆ و پڕو پووچی دەکرد، دەیووت گەر بەس ڕازی بی دەتکەم بە بەختەوەرترین ئافرەتی دونیا، بە شێوەیەك نەزانی غەم و خەفەت چییە هەمیشە لەخزمەت تۆدا ئەبم، کەرازیش بوو غەدرو ستەمی لێبکات بەناڕەوا، موسوڵمان دەبێ بەرەحم و سۆزبێ گەر هاوسەری نیوەی شەو پەنجەیەکی ژان بکات خەو لەچاوی بتۆرێت، هەر کاتێك زانی غەمبار و دڵ تەنگە دڵی خۆشبکا و رەحم و میهرەبانی خوای گەورەی بیر بێنێتەوە، چونکە بەڕاستی زۆر ماندوو هیلاکن بەخزمەت کردنی ماڵ و منداڵ و دروستکردنی خواردن و شۆرینی جل و بەرگ، بۆیە پێی بڵێت: ئەی هاوسەری گوڵم غەم و خەفەت مەخۆ دونیایەکی کاتییە ان شاءالله قیامەت و ژیانی بەهەشتی هەمیشەیمان بۆ هەیە تۆ شوکرو سوپاسی الله بکە خودای گەورە لەبیر مەکە هاوژینی خۆشەویستم ئەم پیاوە هەمیشە دڵی خۆش دەکات، چونکە خودای گەورە فەرمانی کردووە بە پیاوانی ئیماندار بەنەرم و نیانی و هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵ خێزانەکانیان.

﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[1]. واتە: بەجوانی لەگەڵ خێزانەکانتان بجوڵێنەوە بە هەڵسوکەوتێکی چاك.

[1] - سورەتی النساء ئایەتی (١٩).





پاشان چاو لە پێشەنگی چاکەکاران پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەکات بەرامبەر بە خێزانەکانی کە چۆن بووە هەڵسوکەوتی بە جۆرێك جوانترین ئاکارو ڕەوشتی بەکار هێناوە، هەوڵدەدات بەردەوام لەگەڵت باشبێ و وەسیەتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جێبەجێبکات کەفەرمان دەکات لەگەڵ خێزانەکانتان چاك بن.

(وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا)[1]. واتە: وەسیەتان بۆ دەکەم لەگەڵ ئافرەتان باش بن.

بۆیە ئەو پیاوە هەوڵدەدات ژیانێکی بەختەوەر لە ژیانی دونیا لەگەڵت بەسەر ببات.

لێرەوە ئامۆژگاریمان بۆ دایکان و باوکانی بەڕێز ئەوەیە تەنها کوڕی جوان و سەرەوت و سامان نەکەنە مەرج بۆ بەشوودانی کچەکەیان، چونکە زۆرێك لەو کچانە بوونەتە قوربانی ئەو پیاوانەی سەرەتا لە بەر دەوڵەمەندی و بنەماڵە و پلەو پۆستی دونیایان هەبووە، ژیانێکی خۆشی بۆ کچەکەیان دەستە بەر نەکردووە.

بۆیە کچتان بەشوو نەدەن تا لە دین و ئیمانی ئەو گەنجە ئەمین دەبن کە دێتە داوای کچتان، کە زانیتان پەروەردەی مزگەوت و قوتابی و قورئانە، کچتان بە هەموو پۆشاکی ماڵەوەش بێ پێیان بدەن غەمتان نەبێت، سوێند بەخودا پەشیمان نابنەوە، چونکە نمونەمان هەیە لەسەر گەنجی لەخواترس و یەکخواپەرست کە چۆن نمونەی خێزانی بەختەوەریان پێك هێناوە.

مامۆستایەکی بۆخواسوڵحاو بۆی باسکردین، گوتی: ئافرەتێکی بەڕێز نامەیەکی ناردبوو، کەخاوەن سێ کچە و هەرسێکیانی داوە بەشوو، تەنها لەیەك لەزاواکانی زۆر ڕازیە. لە نامەکەیدا بۆی نووسیبووم: خۆزگە دەرگا بەدەرگا خۆم بەدوای نموونەی ئەم زاوایەم گەڕابام بۆ ئەوەی دووکچەکەی تریشم بدایە بە کەسێکی ئاوا چاك و چاکەخواز!!

ئەو ئافرەتە گوتی: زۆر خوازبێنی کچەکانم دەهات،

[1]- (صحیح البخاری، ژمارەی فەرموودە: (٣٣٣١). صحیح مسلم، ژمارەی فەرموودە: (١٤٦٨).





بەڵام منی نەفام هەر لەدوای ناوبانگ و پارە و سامان کەسی دەوڵەمەند بووم تا کچەکانی خۆمیان بدەمێ، هیچ لەبیری ئەوە نەبووم ڕازیش نەدەبووم بیان دەم بە لاوێکی هەژاری چاکی یەکخواپەرست!!

گوتی: دووجار ئەم لاوە ئیماندارە کە ئێستا زاوامە زۆر زۆر خۆشم دەوێ، هات بۆ خوازبێنی هەر ڕەتم کردەوە، چونکە حاڵی ئابووری باش نەبوو.

جاری سێیەم کە هات بەهۆکاری هەندێ کەس و خزم و براکانم و ڕەزامەندی کچەکەم ڕازی بووم بەدڵ گرانی و کچەکەم دایێ .

بەڵام دوای ئەوە بەتێپەڕ بوونی کات، زانیم ئەم لاوە ئیماندارە زۆر زۆر چاکترە لە هەردوو زاواکەی ترم کە دەوڵەمەندن و لەبەر ناوبانگ و پارە کچم دانێ، کەهەردوو کچەکەی ترم لە ناخۆشی و کێشەو هەرادان، بەردەوام دێنەوە لام و زیز دەبن!!!

گەرچی سەیر دەکەم، کچی بچوکم کە داومە بەم پیاوە ئیماندارە، سوپاس بۆ خودای گەورە خاوەن دوومنداڵن و ئەگەرچی بەکرێکاری نان پەیدا دەکات، ئەم لاوە هەژارە لەڕووی دارایی، بەڵام ماڵەکەیان بەهەشتێکەو ئاسودەترین خانەوادەن.

تا ئێستا کچەکەم گلەییەکی بچووکی لێ نییە، لەسەر هەموو ئەم چاکیە بۆ کچەکەم، ئینجا ئەم لاوە ئیماندار و خواویستە ڕۆژێك نامەیەکی جوان و ناسکی بۆم نووسی بوو، کەمنداڵەکانی خۆم ئەوەیان بۆم نەنوسیوە!

بۆی نوسی بوم-:




بسم الله الرحمن الرحیم..

(دایکم ئەی خۆشەویسترین دایك.. چۆن بانگت ناکەم بە دایکم، کە تۆ خۆشەویسترین مرۆڤت پێشکەش بە دڵم کردوە... ؟!

چۆن بە دایکم بانگت ناکەم، کە تۆ ئەم ئافرەتەت هێناوەتە بوون...

ئەو هاوڕێیەی کە ژیانی داگرتوم... من بەختیار ترین مرۆڤی دونیام ...

ئەوەندە بەختەوەرییەم بەسە کە هەمو ژیانم لەگەڵ ئەم کچە دەبەمە سەر کە چەندەها ساڵە لێی دەگەڕێم، لەگەڵ ئەو کچەی تۆ کە بووە بە هاوسەرم و دایکی منداڵەکانم...

تۆ کچەکەت داوەتە من ... بەڵام من دڵ و گیانم داوەتێ).

کەخوێندمەوە لەشم هاتە لەرزین و دەستم کرد بەگریان، چۆن لاوێك کەئاوا دژی وەستامەوە هیچ ڕێزم نەگرتووە تائێستا وەکو پێویست، ئاوا بێت بەرامبەر کێ خەسووی کەهەمومان ئەزانین خەسو و خەزور ڕەزایان گرانە لای زاوا، بەڵام ئێستا تێگەیشتم ئەوەی کچەکەی نەدا بەکەسی چاکەخواز و ئیماندار دەستی ئەچێ بەخۆڵا ماڵی وێران دەبێ[1].

بەڵێ ئەی ئیمانداران ئەمەیە وەسیەت و ئامۆژگاری پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە ئاگادارمان دەکاتەوە دەربارەی ڕەچاو نەکردنی هیچ پلەو پایەیەك و تەنها دین و ئەخلاق ڕەچاو بکەین تاکو بەختەوەری باڵ بکێشێ بەسەرمان و ژیانێکی ئاسوودە بەڕێبکەین، هەروەك دەفەرمووێ:

---

[1] - ئەو مامۆستایەی باسی ئەم بەسەرهاتەی گێرایەوە الحمدلله بانگخوازە لە ئەوروپا جێگای متمانەیە کەسێکی بۆ خوا سوڵحاوە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﴿رضي الله عنه﴾، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾: ( إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ، وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ، وَفَسَادٌ عَرِيضٌ)[1].

واتە: لە (ئەبو هورەیرەوە)(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: گەر یەكێك خوازبێنی كچەكەتانی كرد و ئێوەش لە ئایین و خوڕەوشتی رازی بون، ئەوا بیدەنێ، گەر نەیدەنێ ئەوا فیتنەو ئاشوب لەسەر زەوی بڵاو دەبێتەوە، لەدوایشدا پەشیمانی و نەهامەتیە.

بەڵێ ئەگەر كەسی خاوەن دین و ئیمانتان هەڵنەبژارد، دوورنیە كێشەو ئاژاوە بێتە گۆڕێ چونكە لەوانەیە كەسی خراپ و دوور لەدینی خوای گەورە داخوازی كچتان بكات ئەوكات غەدرو زووڵم لەكچتان بكات. هەروەكو پێغەمبەری ئازیزمان ﴿ﷺ﴾ ئاگادارمان دەكاتەوە، فەرموویەتی. (تَرِبَتْ يَدَاكَ)[2]. واتە: دەستت بە قوڕدا بچێ.

ئەوەش كینایەیە بۆ هەژاری، ئەم قسەیە بەمانای دوعا لێكردنە، بەڵام مەبەست پێی دوعا لێ كردنی راستەقینە نیە، بەڵكو مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە كە پیاو ئافرەتی دیندار بكاتە هاوسەری خۆی، گەر سەرەنجێك بدەینە ئەم فەرمودەیە دەبینین بۆ هاوسەریەتی، دین و ڕەوشتی هەڵبژاردوە لەبەر ئەوەی (دین) گرنگترین مەرجە بۆ هاوشانی.

ئەو پیاوەی پابەندی فەرمانەكانی ئیسلام دەبێ و شتێك كە قەدەغە كرابێ خۆی لێ دوور دەخاتەوە، ئەوا ئەو پیاوە هەڵس و كەوت و مامەڵەو ڕەفتاری بەرامبەر خێزانەكەی چاك و باش دەبێت و ڕێزی ئافرەتەكەو دایك و باوكی و خانەوادەكەی دەگرێ و خۆشی دەوێ و دەبێتە پارێزگاری خێزانەكەی لە هەمو بوارەكان دا.

---

[1] - رواه الترمذي، ژمارەی فەرموودە: (١٠٨٤) ، و ابن ماجة، ژمارەی فەرموودە: (١٩٦٧).

[2] - ( رواه البخاري، ژمارەی فەرموودە: (٤٨٠٢). ومسلم، ژمارەی فەرموودە: (١٤٦٦).





ئافرەتێکیش خاوەن دین و ڕەوشت بێ ئارەزوی نەفس کاری تێ ناکات و چەواشەی ناکات و خۆیشی بەرامبەر بە نەفس بە سوك دانانێ و کارو باری ناو ماڵ فەرامۆش ناکات و لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیداو لە مافەکانی مێردەکەی بێ ئاگا نابێ.

بزانن ئافرەتان پیاوی چاکەخواز و ئیماندار ئەگەر ژنەکەشی خۆش نەوێ هەر ڕێزو حورمەتی دەگرێ، چونکە پێغەمبەری ئازیزمان ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﴿ﷺ﴾ ، قَالَ : قَالَ رَسُول اللَّهِ ﴿ﷺ﴾: (لَا يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً، إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ)[1]. واتە: لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: پیاوی بڕوادار با ڕق و کینەی بەرامبەر بە ئافرەتی بڕوادار نەبێت، گەر لە ڕەوشتێکی ناڕازی بێ و شتێکی پێ ناخۆش بێ، ئەوە ڕەوشتێکی تری بە دڵەو ڕازی دەکات.

سەیرکەن چی ئامۆژگاریەکی حەکیمانەیە بۆلاوان، چیت ماوە ڕێگر بی خوشکی ئیماندارم تا کەسی چاکەخواز و تەقوادار ڕەت بکەیتەوە؟!!!

کە ئەو گەنجەی تەقوادارە خۆشترین ژیانت بۆ دەستەبەر دەکات بۆیە لە ئیسلامدا بەهای پارە و ماڵ و سامان و ناو و شۆرەت و شەهادەو ڕەچەڵەك و بنەماڵە و دەسەڵاتداری هیچ کێشێکی بۆ دانانرێ، ئەوەی گرنگ بێ تەنها ئیمان و ئەخلاقە.

بۆیە ئەی باوك و دایکان ئەی خوشکان، پیاوی لەخواترس هەڵبژێرن بۆ هاوسەریەتی، تاوەکو بە ژیانێکی خۆش بژین و دووربن لە ناخۆشی و زووڵم لێکردن و ژیانێکی تاڵ دڵنیابن گەر وابکەن پەشیمان نابنەوە، لە دونیا و لەقیامەت دا. بەئیزنی الله تعالی.

---

[1] - (اخرجە مسلم، ژمارەی فەرموودە: (٢٦٧٢).



# هۆکار و چارەسەری قەیرە(گەورەکچ).

سەرەتا دەبێ موسوڵمان ئەوە بزانێت کاروباری هەرچی بونەوەرە لە دونیا، مرۆڤ، جن، ئاژەڵ و ڕۆح لەبەران و، دار و بەردو، گیاندار و بێگیان، هەرچی شتێك بوونی هەیە لەسەر زەوی و لە ئاسمان، هەمووی لە ژێرفەرمانی خوای گەورە دان و بۆ چاوتروکانێك و ساتێکی کەمیش خودای پەروەردگار بێئاگا نیە لێیان و ئاگادارە بە ترپەی دڵیان.﴿ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا ﴾[1]. واتە: گەڵای هیچ دارێك هەڵناوەرێو بەرنابێتەوە ئیللا خوای گەورە زانیاری پێیە گەڵای ئەو دارە کەی پێ ئەگات، وە کەی زەرد ئەبێ، وە کەی هەڵئەوەرێ.

خوای گەورە ژیانی دونیای دروستکردووە بۆ مرۆڤەکان، هەمووشتێکی بۆ فەراهەم و رام کردووە تا بەخۆشی ژیان بباتە سەر لە دونیا، ئەم ژیانە خۆشی و ناخۆشی یەکانی هەتا سەرنیەو بەڵکو کاتین، جا مرۆڤ تاقی دەکرێتەوە بەگشت خۆشی و ناخۆشیەك، موسوڵمان دەبێ خۆڕاگرو ئارام گرێت لەسەر گشت تاقیکردنەوەکان، ئەگەر وای کرد ئەوە سەربەرزی دونیا و قیامەت دەبێت.

ژن هێنان و شوکردن سوننەتێکی پیرۆزە لەگشت ئاینێك هەیە و لە دین و بەرنامەی ئیسلامیش گرنگی زۆری پێدراوە، چونکە ئەم سوننەتە قەڵغانەو موسوڵمان دەپارێزێت لە تاوانی گەورەو ناڕەوا، پاشان نیوەی ئیمانی تەواو دەبێت واتە گەر کوڕ و کچێکی گەنج هاوسەر گیریان ئەنجام نەدابوو، بەڵام مولتەزیم بوون بە دین و بەرنامەی ئیسلام دوای ئەوەی هاوسەر گیریان کرد، مانای وایە ئیمانەکەیان کامڵ بووە، چونکە نەفسی مرۆڤ هەمیشە هاندەری خراپە و تاوانە وای لێدەکات سەیری نامەحرەم بکات تووشی تاوانی بکات.

---

[1]- سورەتی الانعام ئایەتی (٥٩).





بۆیە ژن هێنان ئەبێتە بەربەست و قەڵغان بۆ دوورکەوتنەوەی موسوڵمان لەخراپەو، وادەکات چاوی تەنها لەسەر هاوسەری خۆی بێت، بەڵام لەم سەردەمەدا چەندین هۆکار و بەربەست لەبەردەم بەیەك گەیشتنی کوڕ و کچەکانمان دان و، بەمەش تەمەنی گەنجێتیان بەرەو پیری دەڕوات لەکاتێکدا ژنی نیە و شووی نەکردووە، گەنجی وا هەیە تەمەنی سی و پێنج (٣٥)ساڵ و چڵ و پێنج (٤٥)ساڵە کەچی هاوسەر گیری نەکردووە.

چونکە کاتێك هاتوونەتە پێشەوە بۆ داخوازی چەندین هۆکار و کێشە هاتۆتە بەردەمیان، بوونەتە ڕێگر لە بەردەم شوکردنی ئەمەش وای کردووە هەر بە کچ بمێنێتەوە لە کاتێکدا پیر بووە و سەری سپی بووە.

ئەوەی زیاتر لەم نێوەندەدا زەرەر و زیان دەکات تەنها خوشکانی ڕێزدارن، چونکە زۆربەیان بێکەس و غەریب دەمێننەوە، کەسێك نیە دڵیان خۆش بکات هەمیشە فیکر و خەیاڵی خراپ دەکەن بەوەی خۆیان لەناو ببەن! چونکە شوویان نەکردووە و تەمەنیان بەسەر چووە بەرەو پیری هەنگاودەنێن و، دڵیان بە خۆیان ئەسووتێ، لەبەرامبەریش دا لەلایان ناسیارو خزمەکانی و دەوروبەری ڕووبەڕووی چەندان وتەو قسەی ناخۆش دەبنەوە، ها بۆچی شووت نەکردووە؟!

یان دەڵێن: پیربوویت و داواکارت نەهات!، یان هاوڕێ کانت هەموو شوویان کرد تەنها تۆ ماویتەوە، کەس پێت ڕازی نابێ!!!.

لەکاتێکدا هۆکاری شوونەکردنیان یان خۆیانن یان باوك و برا یان خزم و کەسو کار یا هەر هۆکارێکی تر کە پرۆسەی هاوسەرگیریان پەك دەخات.

یان کچی وا هەیە کە دەزانێ گەورە بووە زۆر عیناد و بەفیزە!، خۆی زۆر پێ جوانە بەخۆیا ئەنازێت و، دەڵێت وەعد و بەڵێن بێت شوونەکەم تاوەکو بڕوانامە بەدەست نەهێنم یا کوڕە گەنجێکی چاو شین نەبێت،





یان دەوڵەمەند و خاوەن پارەو سوڵتە نەبێت، یان باڵای بەرز بێت، یان کوڕی کاربەدەست و بەرپرس بێت، یان هونەرمەند و گۆرانی بێژبێت، یان فڵانە عەشیرەت بێت، یان زۆر ئاوات و مەبەستی تر، بەمەش کچەکە داواکاری زۆری هاتووە، بەڵام ئەو مەرجانەی نەبوە کە خۆی ویستوویەتی بەمەش داوای گەنجەکەی ڕەتکردۆتەوە بۆ شوکردن و پرۆسەی هاوسەرگیری دووادەخات.

یان چاوەڕێی ئەوکەسە بووە کە لەمەرجەکانیدا هەیە، کەسی تر زۆر هاتوون بۆ داخوازیی، بەس مەرجەکانی ئەوی تێدا نەبووە، بۆیە هەر وەستاوە لە چاوەڕوانی تا پیر بووەو نەگەشتوە بەو کەسەی کەدەیەوێت و ئەوانی تریشی لەدەست داوە!.

یان هۆکاری تری شونەکردنیماڵەوەیان ڕێگربوونە، گەنجی دیندارو ڕەوشت بەرزی موسوڵمان هاتۆتە داوای کەچی باوك و برای ڕازی نەبوونە!،چونکە لە بنەماڵەی تر بوونە، بۆیە پێی ڕازی نەبوونە، نەیان هێشتوە کچیان شوو بکات بەوکەسە.

یان هۆکاری تر هەن کە دایك و باوك بە کچیان گووتوە تۆ شایەنی کوڕی قۆز و کەشخەو جوانی دەبێت هاوسەرگێری لەگەڵ کوڕێکی وەك خۆت بکەی، بەو جۆرە کچیان هێشتۆتەوە داواشی هاتووە بەڵام نەیان داوە، بۆیە بەم شێوەیە کچەکەیان هێشتۆتەوە تا پیریان کرد و قەیرە بوو .

ئینجا ئەو کچانەی ماونەتەوە، هەموویان پەشیمان دەبنەوە چونکە گەنجانی ئەم سەردەمە ئەقڵیان لە چاویانە تەمەن دەکەنە پێوەر بۆ ژن هێنان، شەرمیان بەخۆیانە کچ لەخۆیان گەورەتربێت.

ئینجا گەنجەکان پێی ڕازی نابن چونکە کچەکە تەمەنی لەوان گەورەترە، بۆیە کەس پێیان ڕازی نابێت، مەگەر ئەو پیاوانەی ژنەکانیان مردووە منداڵیان هەیە دەیانەوێ ژنی تربێنن، تاوەکو منداڵەکانی بەخێو بکات، یاخود پیاوانی تر دەچنە داوای کە ژنیان هەیە دەیانەوێ بیکەنە دووان و سیان و زیاتر...




بۆیە سەرەتا خوشکان کە داخوازیان دێت کە زانیان گەنجی دیندار و لەخواترسە با ڕازیبن، ئەگەرچی گەنجەکە هەژاریش بوو، بێ ناوبانگ بوو بێ پلەو پۆست بوو، بڕوانامەکەی تەنها تەقوا و دینداری و لەخواترس بوو با ڕازی بێت، چونکە دواتر خۆت پەشیمان دەبی لە ڕازی نەبوونت، ئەی خوشکی من سوێند بەخودا کچانێک هەن ماونەتەوە تەمەنیان زۆر گەورەبووە شوویان نەکردووە، دڵیان بەخۆیان ئەسووتێ هاوڕێکانیان هەموو شوویان کردوە، سێ چوار منداڵیان هەیە، بۆیە وەعد و بەڵێن ئەدەن، لەرق و کینەیان ئەڵێن بەماڵەوەیان: گەر ئەمجارە داخوازیان بێ، ئەگەر کابرا چاوێکی کوێریش بێ، کەچەڵیش بێ، دەستێکی پێوەنەبێ، ژنی مردبێ و دە منداڵی هەبێ شووی پێدەکەم!

لە کاتێکدا کە گەنج بوو گاڵتەی بەم مەرجانە دەکرد و پێی عەیبە بوون، ئێستاش پەشیمان بۆتەوە ئینجا کە لە کۆتایی داوای هات، کابراکە نەفام و نەزانە بەدین و ئیسلام، کچەکە لە داخی دەوروبەری بەناچاری بەداوای ڕازی دەبێت، ئەوجا پیاوەکە لەگەڵی خراپ دەجوڵێتەوە، کچە زۆر پەشیمان دەبێت هانا بۆشتی خراپ دەبات و هەوڵدەدات خۆی لەناو ببات، دەڵێت: خۆزگە هەر شووم نەکردبا نەك ئەو ژیانە دۆزەخەم هەبا.

یاخود پیاوەکە زۆر گەورەترە لەو چونکە ژنی مردووە بۆیە ئەوی هێناوە، هاوڕێ و ناسیاوی کچە گاڵتەی پێدەکەن، دەڵێن: پیاوەکەت پیرە سەری سپی بووە حەیف شووت پێکردووە، ئەم هەڵوێستەش وای لێدەکات تووشی خەمۆکی و دڵە ڕاوکێ بێت.

بۆیە ئامۆژگاریمان بۆ خوشکانی گەنجە کە هێشتا لە تافی لاوین، کە ئاواتیان ئەوە بێت لە دونیا هەموو ژیانی بۆ ئەوە بێت خوای گەورە لێی ڕازی بێت، نابێت چاو لە کچانی دوور لە دین و لەخوای گەورە بکەن، چونکە ئەوان نەزان و بێئاگان بەدوای دونیاو خۆشییەکانی کەوتوونە!

گۆرانیبێژ و ئەکتەری سینەماو فیلمیان کردۆتە پێشەنگ و مامۆستایان، بۆیە لە پاشەڕۆژدا زەرەر ئەکەن و پەشیمان ئەبنەوە بەڵام ئەوکات پەشیمانیش دادیان نادات!.

بەڵێ ئەی خوشکم گەر ویستتان زەواج بکەن گەنجی دیندارو خوا ویست هەڵبژێرن، پێش مەرجی جوانی، دەوڵەمەندی، ناوبانگ و پلەو پایە، قەوم و عەشیرەت، پێش هەموو ئەم مەرجانە دین و ئەخلاق و ڕەوشت بێت، سوێند بە الله سەربەرزو بەختەوەری دونیا و قیامەت دەبی، چونکە وەسیەتەکەی خۆشەویستی خوا پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) بۆ گشت کوڕ و کچێکی موسوڵمانە کە ئیمان و ڕەوشت پێش هەموو مەرجەکان بخەن.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ، وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ، وَفَسَادٌ عَرِيضٌ )[1].

واتە: (ئەبو هورەیرە) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەس هاتە داوای ئافرەتان و لە دین و ئەخلاقی ڕازیبوون ئەوە پێی بدەن، ئەگەر وانەکەن فیتنەو ئاژاوە لەسەر زەوی بڵاودەبێتەوە.

ئەگەر کەسێك بەڕاستی لە خوای گەورە بترسێ هیچ کات ئازاری کەس نادات خراپەی بۆ بچوکترین شت نابێت، بۆهاوسەریشی دەبێتە غەم خۆرترین کەسی و بەدونیای ناگۆڕێتەوە.

بۆیە ئەی ئیمانداران براو خوشکانی خۆم بابگەڕێینەوە بۆ لای خوا، بۆلای بەرنامەکەی کە ئیسلامە، سارێژکەری گشت دەرد و کێشەکانە.

ئەو کێشەو دەردانەی مرۆڤەکان پێیەوە دەناڵێنن، یەکتری لەسەر بەکوشتن ئەدەن، گەربزانن چارەسەری لای بەرنامەی خوایە هەموو بەڕاکردن بۆلای ئەگەڕێنەوە .

---

[1] - روى الترمذي، ژمارەی فەرموودە: (١٠٨٤) ، و ابن ماجة، ژمارەی فەرموودە: (١٩٦٧).





﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[1]. واتە: ئاخر بۆ بیرناکەنەوە کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکم و بەرنامەی جوان و دادپەروەرو چاکو بەجێ بێت، بەتایبەت لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

بەڵێ ئیسلام چارەسەری بۆ گشت کێشەکانی کۆمەڵگا پێیە، بۆ نەمانی قەیرەیی ڕێگەی داوە پیاو تا چوار ژن بێنێ، بەمەرجێك پیاو عادل و یەکسان و دادپەروەر بێ لە نێوانیان، گەر نەیتوانی بەیەکسانی لەگەڵیان بجوڵێتەوە، تەنها یەك ژنی بۆ هەیە بهێنێت.

﴿مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُولُوا﴾[2]. واتە: دەتوانن ژنانی تر مارە بکەن دوان بن یان سیان پێکەوە یا چواریش بن هەر ڕەوایە، ئەگەر ترسان کە نەتوانن ژنەکانتان وەکو یەك تەماشا بکەن، با یەکێك بێ یان لەگەڵ ئەوانە ڕابوێرن کە بوونەتە موڵکی خۆتان، بۆ خۆ لە غەدر پاراستن ئەمە کارێ پەسەندە.

بەڵێ ئیسلام ڕێگەی داوە لە یەك ژن زیاتر بێنێ تاوەکو چوار، ئەمەش بۆ ئەوەی چارەسەری گەورەکچی و ڕێگریکردن لە بڵاوبوونەوەی فاحیشەو داوێن پیسی بکات.

بۆیە سەرژمێری ڕێکخراوەکان وایان دەرخستووە کەوا ژمارەی ئافرەتان لە هەموو دونیا هەمیشە لە پیاوان زۆرترن، ئەگەر هەر پیاوێك ژنێك بێنێت، ئەی ئەم هەموو ئافرەتانە کە ئەمێننەوە، چی بکەن و بۆ کوێ بچن؟!

بێگومان خراپە و زیانێکی زۆر لە کۆمەڵگا ئەدات، کێشەو ئاژاوە لەسەر شەرەف و ناموس سەر هەڵ ئەدا، ئافرەتەکە هەست دەکات کە بێکەسە، چونکە کەسێك نییە غەمی بخواو بژێوی و جێگەو شوێنی بۆ دابینکا و حەزو وئارەزووی نەفسی بۆ دەستەبەر بکات، کە ئەویش وەك ئەوانەی هاوسەرگیری کردووە بە ماڵ و منداڵی خۆی چاوی گەشبێ و دڵی خۆش بکات،

---

[1]- سورەتی المائدة ئایەتی (٥٠).

[2]- سورەتی النساء ئایەتی (٣).





دیارە ئەگەر وا نەبوو بیر بکەوە کە ئەم ئافرەتە بێ مێردو بێنازە کە ئەبینێت کەسێ نییە نازی بکێشێت، کەسێ نییە بژێوی بۆ پەیداکات، کەسێ نییە گڕی حەزو نەفسی پێ ئاوا بکات، کەسێ نییە منداڵێکی چاوگەشی پێ بدات، کەسێك نییە دڵی ڕاگرێ جێگەیەکی بۆ پەیدا بکات، بە دڵنیاییەوە هەزارو یەك خەیاڵی لادەرو خراپ بەخەی پێ دەگرێت، ناچار دەبێت بە هەر هۆیەك بێت ئەم کەم و کورتیەی خۆی پڕکاتەوە، ئەگەرچی لە سەر حیسابی فرۆشتنی شەرەفی خۆیشی بێت!

بۆیە ئیسلام ڕێگەی داوە پیاو بە شەرعی ژنی تر بێنێت، نەك ئافرەت بەڕێگای حەرام کەسی تر پێی ڕابوێرێت و توشی تاوانی گەورەی بکات ئابرو ناموسی ئەتك بکات!

بۆیە ئەوانەی دژی فرە ژنین دەیانەوێت بێ ڕەوشتی و بێ ئەخلاقی لە کۆمەڵگا بڵاوبێتەوە، ئەو کەسانە هەمیشە خەونیان بە ڕووتی و بەڕەڵایی ئافرەتەوە بینیوە، تا بێ پەردەو بە ئاشکرا گڕی نەفس و شەهوەتیان وەك ئاژەڵ لێ بەتاڵ بکەن، دەیانەوێ خەڵك وەك ئاژەڵ لێ خورێ و کەس لە حەیا و ناموسی خۆی نەپێچێتەوە، ئافرەتانێکیش بێ ڕەوشت بکەن و هەر ڕۆژە یان هەر شەوە کام پیاوەیان پێ خۆشە لە باوەشیاندا ڕابوێرن و بەزمی شەوێیان پێ خۆش بکەن... هتد.

بۆیە ئەی خوشکانی ژیرم بگەڕێنەوە بۆ ئیسلام و ڕازی بن بە فرەژنی تاوەکو لە دونیا و قیامەت بەختەوەرو سەرکەوتوبن، سوێند بەخوای گەورە ئەو موسوڵمانانەی بەڕاستی لە خواترسن گەر ژنیان هەبوو داخوازیان کرد لێت، ئەوە ڕازیبەو پێت شەرم و عەیبە نەبێ کە سەر بە هەوێ شووبکەی، بەڵام گەر هاتوو دوور لە دین و ئیسلام بوو ڕازی مەبن چونکە لە خودا ناترسێ بۆخۆشی نەفسی خۆی ئیهمالت دەکات وغەدرت لێ دەکات و ناپاکیت لەگەڵ دەکات، بەس ئەوانەی پەروەردی قورئان و مزگەوتن سوێند بەخودا باشترین ژیانت بۆ دەستەبەر دەکەن، چونکە لە خوا دەترسن لە حەقیقەتی دین و دونیا تێگەیشتوونە، ئەزانن ئەم ژیانە کاتیە و مانەوەی تاسەر نیە.





بۆیە هەمیشەو هەموو کات هەوڵی کردنی کاری چاکەو چاکەخوازی ئەدەن، دڵیان بەڕەحمە و پەروەردەی ئیسلام و قوتابی پێغەمبەری خوان ﴿ﷺ﴾ بۆیە زوڵم و غەدر ناکات گەر چوار ژنیشی هەبێ، بەیەکسانی و عەدالەت دەجوڵێتەوە.

بۆیە هەتا گەنجی مەرجەکانت قورس مەکە تاوەکو تەمەنیشت تێنەپەڕیوە ژیانت وێران مەکە. بەگەنجی دیندار و هەژار ڕازیبن بۆ ئەوەی هەر لە دونیا پاشان قیامەت بە خۆشی و بەختەوەی بژین.

بەو باوك و برایانەش دەڵێین: کە بەبێ هۆ کچیان نادەن بەشــوو با لەخوای گەورە بترســن، گوناهیان دەگاتێ کچیان نەدەن بەشــوو، بەســەرهاتی ئەو کچانەی قەیرە بوونە( شێخ محمدی کوری عوسەیمن) لە زانایان دەگێڕنەوە، پیاوێك کچەکەی نادات بەشــوو تا دەگاتە تەمەنی (٢٧) ســاڵی، کچەکە تووشــی نەخۆشــی نەفســی و لاشــەیی دەبێت، تا ئەو ڕادەیەی دەیخاتە جێگا، کاتێ گەیشــتە ســەرەمەرگ ئەم بەســتەزمانە گوتی: کوا باوکم؟ باوکی هات پاشــان کچەکە گوتی: باوکە دوعایەك دەکەم بڵێ ئامین، گوتی: ئامین، کچەکە گوتی: جارێکی تریش بڵێ ئامین، جارێکی تریش گوتی: ئامین هەتا چوار جار پێی دووبارە کردەوە، ئەوجا کچەکە گوتی: خوای گەورە بەهەشــتت لێ حەرام بکات، وەك چۆن لە هاوسەرگیری بێ بەشت کردم، پاش ئەم قسەیە کچەکە مرد.

توخوا چەن گوناهن ئەو خوشــکانەی بەو شــێوەیە ماونەتەوە، دەبێ ژیانیان چۆن بەنارحەتی و غەمەوە بەڕێبکەن، کەبوونەتە قوربانی دەستی باوك و برا و خزمەکانیان، لە بێ بەشبوونیان لەژیانی هاوسەریەتی وەك کچانی تر.

هەندێك قەیرە کچانی تریش لەســەرەمەرگ بەباوکیان گوتوە من و تۆ لە بەردیوانی خوای گەورەدا ڕا دەگرن لە ڕۆژی قیامەتدا من لێت خۆشــنابم چونکە منت نەدا بەشوو.[١]

[١] - (کتێبی قوربانیەکانی خۆشەویستی، لا ١١٤)





بەڵێ هەموو کوڕ و کچێك مافی خۆیەتی و ئازادە نابێ کەس ڕێگربێ لێیان لەوەی بۆخۆیان ژیانی هاوسەریەتی پێکبێنن وەك هەموو مرۆڤێك، بۆیە ئەی باوك و برایان، ئەی ئەوانەی دەبنە ڕێگر لێیان چۆن ناترسن لە دوعای ستەم لێکراو کە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئاگادارمان دەکاتەوە، دەفەرمووێ: (وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ)[1]. واتە: بترسن لە دوعای ستەم لێکراوە چونکە هیچ بەربەستێك نیە لە نێوانیان.

بۆیە منداڵەکانتان ئەمانەتن لاتان لەخوای گەورە بترسن لەوەی بەبێ هۆ نایان دەن بەشوو، هەتا زووە گەر داوای هات کچەکەتان پێی ڕازی بوو، وەگەنجەکە ئەخلاقی بەرزی هەبوو مەبنە ڕێگر لێیان، دواتر خۆتان پەشیمان دەبنەوە، کەئەوکاتیش پەشیمانی هیچ سوودی نیە تەنها غەم و خەفەت و ژانە بۆئەو کەسانە.

کەوابو ئەی کۆمەڵی ئیمانداران لەخوابترسن و بابگەڕێینەوە بۆ بەرنامەی ئیسلام و پێیەوە پابەندبین، بۆ هەر کار و ئاواتێك پشت تەنها بەخودای گەورە ببەستین و بەملکەچی داوای هاوکاری و کۆمەکی تەنها لەو بکەین کەخاوەنی زەوی و ئاسمانە دڵنیابن سەرفرازو سەرکەوتوو ئەبین. بە ئیزنی الله تعالی.



[1] - (رواه البخاري، ژمارەی فەرموودە: (١٤٩٦ ).





## ئایە دەزانی خوا چاودێرتە؟!

یەکێك لە هۆکارە سەرەکی و بنەڕەتیەکانی تاوان و سەرپێچی کردنی فەرمانی خودای گەورە، بریتییە لە نەترسان و هەست نەکردن بە چاودێری خودای بەدەسەڵات.

زوڵم و ستەم و خراپەکاری مرۆڤەکان لەم ڕۆژگارە گەیشتۆتە ئاستی نقوم بوون لە دەریایی قوڵدا کە رزگاربوونی بۆ نیە، مەگەر بە گەڕانەوە و ترسان لە خودای گەورە مرۆڤ رزگاری ببێت و بچێتە ژیانێکی ئارام و ئاسوودە.

موسوڵمان گەر هاتوو ترسی خودا لە دڵی بوو هەرگیز تاوان و زوڵم ناکات، تووشی بەزاندنی سنوری خوای گەورە نابێت، چونکە دەزانێت بە تووڕە بوون و ڕەنجاندنی خودای گەورە سەرەنجامێکی خراپی بۆ دەبێت لە دونیا و قیامەتدا، بۆیە نزیکی تاوان و خراپە ناکەوێت لە ترسی خودای گەورە، ئا ئەمەیە موسوڵمانی ڕاستگۆ و شوێنکەوتەی ئیسلام ترسی خودای پەروەردگار پەردەی دڵی دڕاندووە دایپۆشیوە، دووری خستۆتەوە لە زوڵم و ستەم کردن لە مرۆڤەکان و هانی دەدات بەردەوام بۆ چاکە و چاکەکاری.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: (إتَّقِ الله حَيثُما كُنتَ)[1]. واتە: لە هەر کات و شوێن و حاڵەتێکدا بووی، لە خوا بترسە و پارێزگار بە.

بۆیە موسوڵمانی ڕاستەقینە لەهەر شوێن و مەکانێك بوو، لە ئاشکراو نهێنی، لە خۆشی و ناخۆشی، هەبوونی و نەبوونی، سەرما و گەرما لە خودای گەورە ئەترسێ و هەست بە چاودێری دەکات.

[1] - (أخرجه الترمذي، ژمارەی فەرموودە: (١٩٨٧)، وأحمد، ژمارەی فەرموودە: (٢١٣٩٢).

بەداخەوە زۆرێك لەخەڵکی ئەم سەردەمە ترسی خودا لە دڵ و دەروونیاندا نیە، بۆیە خراپەکاری بۆتە پیشەیان، شەو و ڕۆژ بەردەوام هەر خەریکی دژایەتی موسوڵمان و دین و بەرنامەی خوای گەورەن، هەوڵی ناشرین کردنی ئیسلام ئەدەن بە جۆرەها شێواز.

یاخود گەنجە لەم ڕۆژگارە تەمەنی لە کاری خراپ و ناڕەوا بەهەدەر ئەدا، لەبەیانی تا نیوەی شەو خەریکی یاری ئاتاری و قومار و شەترەنج و دۆمینەیە، یاخود لەگەڵ کچ لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان هەر چی خودای گەورە پێی ناخۆشە دەیکەن و دەیڵێن، نوێژەکانی ئەفەوتێنێ ئەیکاتە قوربانی خۆشیەکی کاتی.

موسوڵمان گەر تۆزقالێك ترسی خودا لە دڵی بوو هیچ کات بیر لە کردنی کاری خراپ ناکەتەوە، هەمیشە خۆی بە دوور دەگرێت و زیکر و یادی خودا لە دڵ و سەر زمانیەتی.

ئافرەتە لە خوای گەورە ناترسێ خۆی ئەڕازێنێتەوە بۆ گورگەکان، لە بازاڕ و پارك و شوێنە گشتیەکان لە دەوامەکەی پێشبڕکێ دەکات بەرامبەر هاوڕێکانی لەسەر ئەوەی کامەیان زیاتر خۆی ئەڕازێنێتەوە جلی سەرنج ڕاکێش لەبەر دەکات، تا گەنجان سەیریان بکەن، گەر هاتوو ترسی خوای گەورە لە دڵ و دەرون و هەستیان بوو لە خراپە ئەیان پارێزێت و تووشی تاوان و بێفەرمانی خودای گەورە نابن.

زۆرێك لەکچان لەترسی باوك و برای لەچك دەکات بۆ دەوامەکەی، بەڵام هەر گەیشتە شوێنی دەوامی چەفیەکەی لادەبات و جوانی خۆی بەدەر ئەخات، تەنها لەماڵەوە کە دێتە دەرەوە لەبەر چاوی باوك و برای تاکو بزانن جەفیەی لەسەرە، ئەمەش ترسی خوای گەورەی لە دڵ دانیە، چونکە نازانێ خوای گەورە هەمیشە چاودێرە بەسەر گشت جولانەوەیەك و لێدانی ترپەی دڵی و بۆ هەر شوێنێ بڕوات لەگەلیەتی و بێ ئاگانیە.

﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾[1]. واتە: بەڕاستی خودای گەورە هەمیشە و بەردەوام چاودێرە بەسەرتانەوە.

---

[1] - سورەتی النساء ئایەتی(١).





بەڵام لە ڕاستیدا خوشکانێکی لەخودا ترس هەن لەماڵیکی نەزان و دوور لەدینی ئیسلام، کە باوك و برایان ڕێگرن لەوەی جلی شەرعی بپۆشێ بۆ دەوام و دەرەوە، کەچی ئەم خوشکە دڵ پڕ لەئیمانە لەترسی باوك و برای جلی شەرعی لەبەرناکات، نەکا ئازاری بدەن و تووشی هەڵوێستەی ناخۆش بێتەوە بۆیە بەدزیەوە لەدەوامەکەی جەفیەو عەبا دەپۆشێ لەترسی خودای هەمیشە چاودێر بەسەر بەندەکانی.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾[1]. واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە پەروەردگاریان دەترسن لە نهێنی و پەنهاندا کەچاوی کەسیان لێوە دیار نیە لە ترسی خوای گەورە تاوان ناکەن، ئەمانە لێخۆشبوونی خوای گەورەیان بۆ هەیە ، ئەجرو و پاداشتێکی یەکجار گەورەیان بۆ هەیە.

لەخودا ترسی ڕاستەقینە خۆیان دەپارێزن لەسەرپێچی خوای گەورە لە قەرەباڵغی و تەنهایدا، هەمیشە ترسی لەخودایە و هەست بەچاودێری دەکات، ئەمەش خوشکێکی ئیمانداری پێشینە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) چۆن لە چاودێری خودای گەورە ترساوە:

(قال العتبي: لقي رجل اعرابية فأرادها على نفسها فأبت وقالت: أي ثكلتك أمك! أما لك زاجر من كرم؟ أما لك ناه من دين؟ قال: قلت: والله أنا لا يرانا الا الكوكب! قالت: وأين موكبها؟)[2]. واتە: عەتەبی دەڵێ: پیاوێك لە جێیەکی چۆڵدا دەگات بە ژنێکی دەشتەکی و داوای کاری بەدڕەوشتی لێ دەکات، ئەو ژنەش لە وەڵامدا دەڵێ: دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆبکات، ئایە شەرم و ڕێزت بەرگریت لێ ناکەن لەم کارە؟ یان دینەکەت ئیسلام بەرگریت لێ ناکات؟ ئەویش گوتی: سوێند بەخوا جگە لە ئەستێرەکانی ئاسمان کەس نامان بینێت، ئافرەتەکەش گوتی: ئەی ڕاگیرکەری ئەو ئەستێرانە لە کوێیە؟! کابرا سەری داخست و ڕۆیی.

---

[1] - سورەتی الملك ئایەتی (١٢).

[2] - الجامع لشعب الايمان (٥٠٦/٢).





بۆیە گەر سەیری نمونەیی ئافرەتانی پێشین بکەین چۆن لە خودا ترساون و جیاواز بوونە لە ئافرەتانی ئەم سەردەمە، بۆیە پێویستە خوشکان چاو لە ئافرەتانی پێشین بکەن، کە نموونەی پێشەنگ بوون لە هەستکردنیان بە چاودێری خودای گەورە، دوورکەوتنەوە لە تاوان و سەرپێچی کردنی فەرمانی خودای بەدەسەڵات، نەك چاو لێکردن لە ئافرەتی گۆرانیبێژ و بەناو شاجوانەکان و ئەکتەری سینەماو فیلم، کە چۆن شەرمیان نیە لاشەی خۆیان ئەخەنە پێش چاوی گورگەکان تاکو نەفسیان پێ تێربکەن.

با بچینەوە خزمەت قوتابیانی ئەهلی تەقوا و ئیمان نمونەیەك لە خوشکانی پێشینمان بخەینە ڕوو کە چۆن نمونەی شەرم و شکۆ و ئەخلاق بەرزی ئومەتی ئیسلام بوونە و دوور بوونە لە ئافرەتانی ئەم سەردەمەی دونیا ویست و دونیا پەرست.

(فاطمة بنت العطار البغدادية رحمه الله، قال عنها أخوها : انها خرجت من البيت ثلاث مرات فقط : يوم تزوجت، ويوم حجت، ويوم ماتت)[1].

واتە: (فاتیمەی کچی العطاری بەغدادی) (رەحمەتی خودای لێ بێت)، براکەی لەبارەیەوە دەڵێت: (فاتیمە) لەماڵەکەی تەنها سێ جاران دەرچووە بۆ دەرەوە: ئەو ڕۆژەی زەواجی کرد، وە ئەو ڕۆژەی حەجی کرد، وە ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد.

لەترسی خوای گەورە خۆی پاراستووە لە چونە دەر و گەڕان بۆ شوێنە گشتیەکان تا نەبێتە هۆکاری فیتنەو هەڵخەڵەتاندنی گەنجان، بەڵام ئافرەتانی ئەمڕۆکە ژیانیان بۆتە چوونەدەر بۆ بازار و خۆڕازاندنەوە بۆتە پیشەیان، یەك ڕۆژ نەچن بۆ بازار بێتاقەت و غەمبار ئەبن، بۆ یەك دەرزی دوورومان دەچێت بازاڕ ســەراوبن دەکات و دەگەڕێت بەجلی ناشەرعی و کیلۆیەك مکیاژ بەخۆشی دەڵێت من موسوڵمانم.

[1] - (تاريخ الاسلام للذهبي( ١٢٦/٤٠ ).





بەڵام بەداخەوە لەم ڕۆژگارە ئافرەت و کچانی ئەم سەردەمەمان هێندە خۆیان بەدەرئەخەن بۆخەڵکی کاتێك ئەچنە دووکانێکەوە کابرای خاوەن دووکان بەیەك سەیرکردن ئەزانێ قیاسی لەشیان چۆنەو پێیان دەڵێت: فەرموو ئەمە بەقیاسی خۆتە!!

سبحان الله چۆن کەوتووینەتە سەردەمێك کە هەستکردنمان بە چاودێری خوای گەورە لە دڵ و دەروونمان نەماوە، نەترسان لەخوای گەورە لەناو خەڵکی دا بۆتە هۆی پەرەسەندنی تاوان و بڵاوبوونەوەی بەسەر زەوی وەك گەردەلوولی بەهێز!.

ئێمە ناڵێین مەڕۆ دەرەوەو خۆت بەندبکە لەماڵەوە ئەی خوشکی لەخودا ترس و بەحیشمەتم، دەتوانیت بڕۆیت بۆ دەوام، بۆبازار، بەڵام بەشێوازی شەرعی و جل و بەرگی شەرعی، سنوری خودا مەبەزێنە، ئینجا ترسی خوای گەورە لە دڵت بچەسپێنە، خۆت پڕ چەك بکە بەتەقوا و ئیمان، ئەوکات شەیتانیش ناتوانێ هەڵت خەڵتێنێت نەك مرۆڤە خراپەکان، بۆیە ئەو کەسانەی فەرمانی خوای گەورە پشتگوێ دەخەن، دڵ و دەرونیان پەروەردە نەکردووە لە قوتابخانەی ئیسلام لە وانەی ئیمان و تەقوا.

ئەگەر سەیری ژیانی هاوەڵ و شوێنکەوتوو و پیاو چاك و زانا پێشێنەکان بکەین (رەحمەتی خوایان لێبێت) کە بەچ ڕادەیەك لە خودا ترساون بەڕاستی مرۆڤ وا هەست دەکات ئەوان فریشتە بوونە و ئێمەی مرۆڤیش بەرد و دار، ئەوان بەئەندازەی زەوی و ئاسمان جیاواز بوونە لە بەناو موسوڵمانەکانی ئیمرۆ، چونکە سیفەت و ڕەوشت و تەقوای وایان هەبوو شایەدی ئەو ڕاستیەیان بۆ دەدات.

نمونەی لە خوداترسانی پێشینی ئوممەت، (عومەری کوری عبدالعزیزە) (رەحمەتی خوای لێبێت) کە بە خەلیفەی پێنجەم ناسراوە، بەهۆی پابەندبوونی بە جێبەجێکردنی یاساکانی ئیسلام و لەخواترسانییەوە، ئینجا بەیەکەوە بچینە خزمەت (فاتیمەی) خێزانی (عومەری کوری عبدالعزیز) (رەحمەتی خوا لەهەردووکیان بێت) کاتێك پرسیاری لێدەکەن دوای وەفاتی (عومەر): ئایە (عومەر) چ کار و کردەوەیەکی دەکرد ئاوا بەوشێوەیە لە خوا ترساوە؟





چونکە ئیمامی (عومەر) لە لای باسی مردن و قیامەت بکرایە دەستی ئەکرد بەگریان، زۆر جار لەهۆش دەچوو، لە وەڵامی خێزانیدا فەرمووی: (عومەر) هیچ کاروکردەوەیەکی لە نوێژ و ڕۆژ و شەونوێژی لە ئێوە زیاتر نەکردوە، بەڵام سوێند بەخوا نەم دیوە هیچ کەسێك بە ئەندازەی (عومەر) لە خواترسابێت، بەڵکو ترسانی لە خوا بەئەندازەیەکی وابوو گەر لە ناو جێگادا خوای بیرکەوتبایە، لە ناو جێگەکەی ڕادەپەڕی وەك چۆلەکە باڵە تەپەی پێ دەکەوت لەترسی خوا تا دەمان گوت: سبەینێ ڕۆژ دەبێتەوە و بێ خەلیفە دەبین، واتە دەمرێت.[1]

ئەمە نمونەیەك بوو لە نێو سەدان نمونەی قوتابیانی پەروەردەی ڕەسەنی ئیسلامی، ئەم قوتابیانە دڵ و دەروونیان هەڵقوڵاوی قورئان و سوننەت بوو، دڵەکانیان شۆردبوویەوە بەوانەی ئیمان لە قوتابخانەو مەڵبەندی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم قوتابیانە هەتا لە دونیا بوون هیچ خۆشییەکیان نەبینی هەروەك مامۆستاکەیان کە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کەچی گەورەی موسوڵمانان بوون و دەسەڵاتیان لەژێر دەستدا بوو، دەیان توانی وەکو هەموو سوڵتان و پادشاکان دونیا بەخۆشترین شێوە ژیابان، بەڵام ژیانی دوارۆژی نەبڕاوەیان هەڵبژارد لە بەرامبەر ژیانی دونیای کاتی.

ئەگەر سەیری هەمان قوتابی ئیسلام و شوێنکەوتەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە خوداترسی ڕاستەقینە (عومەری کوری عبدالعزیز) بکەینەوە بچینەوە خزمەتی، کە کاتێك بوو بە ئەمیری موسوڵمانان خەلیفایەتی کەوتە ئەستۆی پارەو موڵکی دەوڵەت هەمووی لە ژێر دەست بوو، بەڵام خۆشی و ڕابواردنێکی نەبینی تامی لێبکات و جێگای باسکردن بێت، بەڕادەیەك خۆشی و ڕابواردنی دونیا و دەسەڵاتی ئوممەتی ئیسلام لە ئەستۆ بوو، ئەی توانی گەمە و یاری بەسەروەت و سامانی موسوڵمانەوە بکات بەڵام نەیکرد نزیك خۆشی دونیا نەکەوت، ئینجا خواردنی سەرەکی خۆی و ماڵ و منداڵی نیسك بووە.

---

[1] - عمر بن عبدالعزیز_ دکتۆر الصلابی. (لا:٦٤).





بۆیە ئەم کەلە پیاوانە بەڕاستی هەستیان بە چاودێری خودای گەورە کردووە، خۆشی و رابواردنی دونیایان لا تاڵ بووبوو، ئەیانزانی خودای گەورە ئاگادارە بەنیاز و نیەتی دڵیان.

﴿ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ ﴾[1]. واتە: ئەوەش بزانن کە خوای گەورە ئاگای لەو خورپەو خترورانەشە کە بە دڵ و دەروونتاندا دێت و دەیانزانێت، جا کەوابوو هۆشتان لە خۆ بێت بە حەزەر بن.

بۆیە ئەی بەندەی خودا با ئاگاداری خۆمان بین نەکەین سنوری خودای گەورە ببەزێنین و دژایەتی دینەکەی بکەین، سوێند بە خودا ئەگەر لەگەڵ خودا ڕاستگۆ نەبین و دژایەتی بەرنامەو بەندە دڵسۆزەکانی بکەین ئەوانەی پابەندن بە ئیسلام و فەرمانی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ئەوا خودای گەورە تووشی خراپترین و ناخۆشترن سزامان دەکات گەر لە دونیاش نەبێت، لەقیامەت دۆزەخی بەرد سوتێنەر جێگامان دەبێت پەنا بەخودای گەورە.

بەڵێ لە دونیابووین وامان دەزانی کەس ئاگای لێمان نیە، بەنهێنی تاوان و خراپەو دزی و زوڵم و ستەم و هەرچی خراپەیە ئەمان کرد، دژایەتی ئیسلام و قورئان و قسە و ئیهانە کردن بەموسوڵمانان بەبێ ئەوەی هەست بە چاودێری خودای گەورە بکەین، ئینجا لە قیامەت کاتێك نامەی کردەوەکانمان ئەدرێتە دەست کە ئەبینین هەموو تاوان و سەرپێچی خودای گەورە بووە، ئەوکاتی پەشیمان بوونەوە سودی نیە، بڵێن: خۆزگە وامان نەکردبا، خۆزگە ئەو کارە چاکەمان کردبا، سوێند بەخودا گشت کردەوەکانمان بچوك و گەورە پیشان ئەدرێتەوە، ئەوکاتی سەریان سوڕدەمێنێ تاوانباران کاتێك کردەوەکانیان ئەبینن هیچ تاوانێك لەبیر نەکراوە، نهێنی و شاراوەی گشتی نوسراوە.

---

[1] - سورەتی البقرة ئایەتی (٢٣٥).





خودای گەورە بۆ بیر هێنانەوەی بەندەکانی دەفەرمووێ:
﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَـٰذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا ۚ وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا﴾[1]. واتە: نامەی ئەعمال (تیانووسی کار و کردەوە) هەموویان دەهێنرێتەوە پێش لە تەرازوودا دادەنرێت و دەدرێتەوە دەستیان، جا دەبینیت ئەوانەی تاوانبارو جینایەتکارن لە ترس و بیمدان، چونکە دەترسن لەوەی لەسەریان تۆمار کراوە، دەشزانن حەقە و ڕەوایە و هەر ئەوەیە کە خۆیان کردوویانە، نە زیادیان پێوە نراوە و نە فەرامۆش کراوە، بۆیە دوعا لە خۆیان دەکەن و شین و واوەیلا دەکەن و دەڵێن قوڕمان بەسەر خۆ ئەم (نامەی ئەعمال)انەمان هیچ گوناحێکی فەرامۆش نەکردووە نە بچوك نە گەورە ئیلا هەر هەمووی تێدا تۆمار کراوە.

بۆیە ئەی بەندەکانی خوا با هەموومان بە ملکەچی بگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە، دان بە ئیسلام و گشت ڕێسا و یاساکەی دابنێن، گشت کاتێك غەمی ئەوەمان بێت هەوڵی بلاوکردنەوەی بدەین، تامرۆڤایەتی بحەسێتەوە لەسایەی ڕەحمەتی بەرنامەی ئیلاهی و با هەموو کات ترسی خودای گەورە لە دڵمان بێت، بۆئەوەی وامان لێ بکات هەمیشە دووربکەوینەوە لە هەموو تاوان و خراپەیەك.

ڕەحمەتی خوداتان لێبێت با بەئاگا بێنەوە هەمووکاتێك هەست بە چاودیری خودای گەورە بکەین، دڵنیابن ئەو کات تووشی خراپە و بێ فەرمانی خودای گەورە نابین، ئەبین بە موسوڵمانێکی کامڵ، لەو قوتابیە دونیا نەویستانە ئەبین کەلەسەر ڕێبازی ڕاستەقینەی ئیسلامن بەرەو ڕێگای سەرفرازی و شوێن پێی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هنگاو دەنێن تا مسۆگەری بکەن بەهەشتی فیردەوس، بەئیزنی اللە تعالی.

[1] - سورەتی الکهف نایەتی (٤٩).





# شەیتان ڕێگات لێ ون نەکات.!

ئەم سەردەمە زۆرێك لە موسوڵمانان قیامەتی خۆیان دەفرۆشن لە پێناو دونیا و خۆشییەکانی، بەڵام ئەو کەسانە زۆر بێئاگا و نەزانن، چونکە چۆن ژیانی قیامەت و بەهەشتێکی هەتا هەتایی ئەگۆڕنەوە بە خۆشی دونیایەکی کاتیی و بڕاوە.

ئینجا کاتێ قیامەت بەر پا ئەبێت گشت خەڵکی ئەگەڕێنەوە بەردەم بارەگای خودای گەورە بۆ لێپرسینەوە، ئەوانەی لە دونیا خزمەتکاری خراپەکاران بوون لە ژێر فەرمانیان دەر نەئەچوون، ئیشان بۆ ئەکردن، غەدریان لە هەژار و نەدارەکان ئەکرد جاسوسیان بۆئەکردن دژی موسوڵمانان پشتیان بوون لە بڵاوکردنەوەی بێ ڕەوشتی و تاوان و خراپە، لە ڕۆژی دوایی ئەو خەڵکە لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، بەرەو لێپرسینەوە بۆ بارەگای خودای کارزان بەرێ ئەکرێن.

﴿وَبَرَزُوا لِلَّهِ جَمِيعًا﴾[1]. واتە: وە هەموویان لەرۆژی قیامەتدا لەگۆڕەکانیان دەردەکەون لەبەردەم دەسەڵاتی خوادا بۆ لێپرسینەوە.

ئینجا ئەوکات بەو کەسانە ئەڵێن کە کاریان بۆ ستەمکاران ئەکرد لە دونیا هەموو کات لەخزمەتیاندا بوون دژی بەرنامەی خودای گەورە.

﴿فَقَالَ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا﴾ واتە: ئینجا کزو لاوازو شوێنکەوتووەکان دەڵێن: بەوانەی کەخۆیان بەزل دەزانی بەڕاستی ئێمە لەدونیادا شوێنکەوتوو و پەیڕەوانی ئێوە بووین و هەرچیتان بگوتبایە بەگوێمان دەکردن.

ئاخۆ ئەبێت چیان پێ بڵێن: داوای پارە و ماڵی دونیا و سەیارەیان لێدەکەن؟، نەخێر تەنها داوای ئەوە دەکەن لە سزاو عەزابی خودای گەورە بیان پارێزن و لەسەریان سووك بکەن، چونکە لە دونیا ئیش و کاریان بۆیان ئەکرد،

[1] - ئەم ئایەتە تاکۆتای بابەت سورەتی ابراهیم لە ئایەتی (٢١-٢٢).





کردبوونیان بەخودای خۆیان لەفەرمانی ئەو ستەمکارانە بەهیچ جۆرێك دەرنە ئەچون و بەگەورەیان ئەزانین.

﴿فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِن شَيْءٍ﴾ واتە: دە ئاخۆ ئێوە ئەمڕۆ دەتوانن لەبەشێ لەسزای خودا بمانپارێزن؟.

بەڵام دەبێ وەڵامی ئەو ستەمکار و هاوڕێ خراپانە چی بێت بۆ ژێر دەستەکانیان لە قیامەت، کە لەدونیا بۆ گشت کارێکیان هەمیشە دەست لەسەر سینگ بوون.

لە وەڵامی ژێردەستەکانیان دەڵێن:

﴿قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ﴾ واتە: ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر خوا لەدونیادا ئێمەی بۆ خۆ رزگارکردن رێنما کردبا ئەوا ئێوەشمان لەگەڵ خۆمان شارەزاو رێنمادەکرد بۆ خۆ دەربازکردن لەم سزایەی ئەمڕۆ دووچارمان بووە.

بەڵێ براوخوشکانی من بیربکەنەوە ئەمانە خۆیان لەدونیا بەدوای ڕێگای پوچ و گومڕای کەوتبوون لە پێناو خۆشییەکی کەمی کاتی دونیا کە هەواو هەوەسی خراپیان بوو، غەمیان ئەوە نەبو خەڵکی بۆقیامەت هان بدەن، بەڵکو غەمیان ئەوە بوو کامە ڕۆژ زیاتر بەخۆشی و ڕابواردن بەسەر ببەن، جا لە بارەگای خودای گەورە بە ژێردەست و لاوازەکانیان ئەڵێن: ئێمە تازە هیچمان پێ ناکرێت، گەر سەبرو ئارام بگرین لەسەر ئەوسزایە یان هاوارو ناڵەو ناسۆرە دەربڕین، هیچ جیاوازی نیە تازە سزاو عەزابمان لەسەر سووك نابێ و لا ناچێت، چونکە لە دونیا بێ فەرمانی خودا بووبووە پیشەیان.

﴿سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ﴾ واتە: جا ئێستاش نارەحەتیی و، بێتاقەتیی بکەین و بیکەینە دادو هاوار، یان بەئارام و لەسەرخۆو بێدەنگ بین، بۆ هەردوولامان یەکسانە و رزگارنابین و هیچ دەرەتان و پەنایەکمان نیە بۆ رزگار بوون لەسزا.

بەڵێ کە ڕۆژی قیامەت هات هیچ چارە و ڕێگایەك نامێنیت بۆ خوانەناس و دونیا پەرستەکان، چونکە تا لە دونیا بوون وازیان لە ڕێگای یەکخواپەرستی هێنا بوو، هەر بەدووای ڕێگای خۆشی و بەدەستهێنانی سوڵتەو و سەروەت و سامان بوون.





جا شەیتانی نەفرەت لێکراو، دێتە قسە لەسەر موناقشەی کاربەدەست و ژێردەستەی کار بەدەست، ئینجا لەناو دۆزەخ شەیتان هەردوولایان ڕیسوا دەکات و بێدەنگیان ئەکات بەوەی لەدونیا ڕێگای خودای گەورەیان ونکردبوو لەپێناو نەفسی خراپییان.

﴿ وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ ﴾ واتە: ئیتر دۆستە مەزن و گەورەکەیان (شەیتان) سەرزەنشتیان دەکاو دەڵێت: بێگومان خودا لەدونیادا لەسەر زمانی پێغەمبەران بەڵێنێکی ڕاست و دروستی پێدان بەزیندوو بوونەوەو جەزاو پاداشت وا هێنایە دی.

شەیتان باوەڕی بەهەموو شتێك بوو لە دونیا ئەی زانی ڕێگاکەی خۆی کە لەسەر یەتی باتل و هەڵەیە، بەڵام دەیویست مرۆڤەکانیش گومڕابکات، تۆڵەی خۆی بکاتەوە بەوەی نەفرەتی لێکراوە لەلایەن خودای گەورە، چونکە شەیتان یەکەمجار لە بەهەشت بوو، بەهۆی ئەوەی بەگوێی فەرمانی خودای نەکرد سوجدەی نەبرد بۆ ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) بۆیە خوای گەورە دەری کرد لەبەهەشت، ئەوکات شەیتان بڕیاریدا نەوەکانی ئادەم گومڕابکات لەڕێگای ڕاستەقینەی ئیسلام، هەروەك خوا لەسەر زمانی شەیتان دەفەرمووێت: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾[1]. واتە: شەیتان گوتی: سوێند بەعیزەتت ئەی خودایە هەر هەموویان گومڕا دەکەم.

ئینجا مرۆڤەکان زۆرێك لە دونیا شوێنی کەوتن و قیامەتیان وێرانکرد لە پێناو خۆشی کەمی دونیا، بەڵێ ئەوکاتەی کەقیامەت داهات و گەڕانەوە بۆ لای خودا تاوانباران بڕوا بەڕاستیەکە ئەکەن، کە تازە قیامەتە، کاتی لێپرسینەوەیە، بەڵام لە دونیا شەیتان لەبیری بردبوون و ڕێگای لێ ون کردبوون، بەهۆی ڕازاندنەوەی تاوان لایان هەر دەیان گوت: کورە ڕابوێرە دونیا فشەیە جارێ زووە و گەنجین با خۆشی ببینین، بزانە شەیتانی دوورخراو لە ڕەحمی خوای گەورە چۆن پاشگەز دەبێتەوە لەوەعد و بەڵێنەکانی و خۆی بەدرۆ ئەخاتەوە کە لەدونیا بەمرۆڤەکانی دەدا دەڵێت:

---

[1] - سورەتی ص ئایەتی (٨٢).





﴿وَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾ واتە: وە منیش بەڵێنی ناڕاست و درۆو دەلەسەم پێدان بەڵام من بەڵێنەکەی خۆمم نەبردە سەرو بەپێچەوانەوە فریوم دان و ناتوانم یارمەتیتان بدەم.
بیربکەوە ئەی ئەوکەسەی هەر لەسەر ڕێگای گومڕایت پشتی بێدینەکان ئەگریت و چوویتە سەر غەیری بەرنامەی ئیسلام، شەیتان دەڵێت: من هیچم پێناکرێت بۆ ئێوە لەپاش ئەوەی گومڕای کردن و ڕێگای خودای لێ ون کردن.
بۆچی بیرناکەیتەوە تاکەی واز ناهێنیت لە سەرپێچی فەرمانی خودای گەورە، شەیتانی نەفرەت لێکراو هیچ هێزو دەسەڵاتێکی نەبوو تاگومڕات بکات گیانی تۆی بەدەست نەبو تا لێی بترسی و لەفەرمانی دەرنەچیت، بەڵکو تەنها وەسوەسەی بۆ دروست ئەکردی لەسەر ئەوەی بۆ دونیا هەوڵبدەی و پشت لەدینی خوابکەی و بۆخۆشییەکی کەم بانگی ئەکردی.
﴿ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي ﴾ واتە: خۆ لەوکاتەیشدا هیچ هێزو دەسەڵات و بەڵگەو نیشانەیەکم بەدەستەوە نەبوو، هەتا بەزۆر گوێرایەڵتان بکەم ئەمە نەبێت کەگومان و دوو دڵیم بۆ پەیداکردن و، بانگم کردن بۆ گومڕایی خێرا ئێوەیش وەڵامتان دامەوەو بەگوێتان کردم و بەدەنگمەوە هاتن.
بەڵێ ئەی براو خوشکانی من خۆمان بە ویست و ئارەزووی خراپی خۆمان ڕێگای گومڕایمان هەڵبژارد، بۆیە شەیتانی نەفرەتی لەناو سزای پڕئازاری جەهەنەمدا دەڵێت: تازە لۆمەی من مەکەن کە هەموو شتێك تەواو بووە، بەڵکو لۆمەی خۆتان بکەن چونکە هیچ دەسەڵاتی دونیاو دواڕۆژم نەبوو پێتان بترسێنم تا فەرمان بەرداریم بکەن.
﴿ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنفُسَكُم ﴾ واتە: جاکەوابوو ئەمڕۆ کەئێوە دووچاری سزاو عەزاب بوون، سەرکۆنەو سەرزەنشتی من مەکەن بەڵکو لۆمەو سەرزەنشتی خۆتان بکەن.
شەیتانی دوورخراو لە ڕەحمی خودا، ڕاست دەکات بەوەی مرۆڤەکان ڕێگای گومڕاییان گرتەبەر بەوەش پاداشتیان تەنها دۆزەخ دەبێت.
شەیتان ئەوکات دەڵێت: من تازە ناتوانم هیچ هاوکاریتان بکەم، نە سووکردنی سزاتان، نە واستە، نە پشتیوانی هیچی پێناکرێت بۆ مرۆڤەکان و خۆیشی لە ئاگردایە.





﴿ مَّا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ ﴾ واتە: من ناتوانم فریاتان کەوم، هەتا لەسزا ڕزگارتان بکەم و ئێوەیش ناتوانن فریای من بکەون، هەتا لەسزا ڕزگارم بکەن.
کەوایە زانیت ئەی بەندەی خودا، حاڵی ئەوکەسانە چۆنە لەقیامەت بەهۆی ئەوەی لەدونیا پشتێکەربوون لە بەرنامەی خوای بەدەسەڵات، بۆ غەیری دینی خودا کاریان دەکرد و خۆیان ماندوو دەکرد و شەو ڕۆژیان لەسەریەك دانابوو.
بۆیە شەیتانی نەفرەتی دەڵێت: من بڕوام نەبوو بەوەی بەهەواو نەفسی خراپی خۆتان منتان کردبوو بەهاوبەش بۆخودای زەوی و ئاسمان هەمووتان بەدەنگمەوە دەهاتن بۆ ڕێگای گومڕایی و خراپەکاری.
﴿ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ﴾ واتە: دڵنیاشبن کە من بێزارم لەوە کە لەدونیادا منتان کردە شەریك و هاوەڵی خواو بەگوێتان کردم.
بەڵێ ئەی بەندەی خودا بالەئێستاوە بە ئاگابێینەوەو گەر بزانن پاداشتی خراپە کارو دونیاپەرستەکان چیە لە دوارۆژ هیچ کات ڕێگای گومڕای ناگرنە بەر.
﴿ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[1]. واتە: ئەوجا خودای گەورە دەفەرموێ: بەڕاستی ستەمکاران، ئەوانەی پشتیان لەهەق کرد، سزای ئێش پێ گەیەنەروو ناڕەحەت کەریان بۆهەیە.
کەوایە تا نەمردووین با بگەڕێینەوە بۆ ژێر سێبەری بەرنامەی خوای گەورە، چونکە بەڕاستی لە قیامەت پەشیمان بوونەوەمان هیچ سوودێکمان پێ ناگەیەنێت.
﴿وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴾[2]. واتە: هەروەها دەڵێن: ئێمە ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاغاو گەورەکانمان بووین، هەر ئەوان ڕێگەو ڕێبازی ڕاستیان لە ئێمە شێواندو ون کرد (خودا ڕسوایان دەکات).

---

[1] - ئەم ئایەتە تاکۆتای بابەت سورەتی ابراهیم لە ئایەتی (٢١-٢٢).
[2] - سورەتی الاحزاب ئایەتی (٦٧).




لە ڕۆژی قیامەتدا کەس خۆزگە ناخوازێت کە بەدوای فلان و فیسار کەوتبا بەڵکو تەنها خۆزگە دەخوازێت کە گوێڕایەڵی خودای گەورە و پاشان پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کردبا، ئەو خەڵکە لە ناو ئاگری جەهەننەمدا هاواردەکەن دەڵێن: خودایە ئێمە گوێڕایەڵی (سَادَتَنَا) واتە: گەورەکانمان و سەرۆکەکانمان وە (وَكُبَرَاءَنَا) واتە: زانا و مەلا و شێخ و ئەمیرەکانمان بووین، ئەوان گومڕایان کردین، واتە: ئەوان بوون کە ئێمەیان گومڕاکرد و کافریان کردین بە قسەی لوس و بریقەدار، خوای گەورە پەنامان بدات.

کەوایە با مەردی خودابین لە ئێستاوە با لەپێناو خۆشیەکی کەمی دونیایی قیامەت لەدەست نەدەین کەژیانێکی نەبڕاوەیە، با دوای هەنگاوەکانی شەیتان نەکەوین چونکە بەڕاستی شەیتان دوژمنی مرۆڤە.

﴿ وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ ﴾[1] واتە: نەکەن دوای هەنگاوەکانی شەیتان بکەون چونکە بەڕاستی شەیتان دووژمنێکی ئاشکراتانە.

بۆیە ئەی بەندەی خودا با بەڵێن بدەین لەم ژیانەی دونیا بۆ خودای گەورە بژین، هیچ خۆشیەکی دونیا هەڵمان نەخەڵتێنێت کە ببێتە هۆی گومڕابوون و لادانمان لە ڕاستە شەقامی ئیسلام، تاکو بەئیزنی الله تعالى لە دەستەو کۆمەڵی بەهشتیەکان بین و دانەبڕێن بۆ هەمیشەیی.



[1] - سورەتی البقرة ئایەتی (١٦٨).







# سەرنجامی بڕوادار

ئەم ژیانەی دونیا مانەوەی تێیدا بۆ مرۆڤەکان پاشەڕۆژ و سەرەنجامێکی ڕوونی نیە جێگای ئومێد و دڵخۆشی بێت بەوەی ژیانی هەمیشەی ببەیە سەر، بەڵکو مانەوەی گشت خەڵکی کاتییەو ڕۆژێکی بۆ دیاری کراوە، بەفەرمانی خودای گەورە بۆ دەرچوون لەم دونیایە بۆ شوێن و مەنزڵگای هەمیشەیی کە قیامەتە.

﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُؤَجَّلًا﴾[١]. واتە: وە هیچ کەسێکیش نیە کە بمرێ تەنها بە ئیزنو فەرمان و ئەجەلی خودای گەورە نەبێ کە نووسراوەو کاتەکەی دیاریکراوەو پێشو دوا ناکەوێ.

لە قیامەت دوو شوێن و جێگا ئامادە کراون، بۆ دوو دەستە لە خەڵکی، دەستەو کۆمەڵی خوای گەورە، پاشان دەستەی بێ بڕوایان و تاوانباران، لەبری چاکەکردن بۆ ڕەزامەندی خوای پەروەردگار، وە لەبری سەرپێچی و فەرامۆشکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە، و گرتنەبەری ڕێگای گومڕایی و دژایەتی ئاینی ئیسلام و شوێنکەوتوانی، ئەم دوو شوێنە ناونراون بە (بەهەشت)، (جەهەننەم).

﴿وَتُنْذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾[٢]. واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بیان ترسێنە لە ڕۆژی قیامەت کە ڕۆژی کۆکردنەوەی سەرجەم خەڵکییەو هیچ گومانێکی تیادا نیە لەو ڕۆژەدا خەڵکی ئەبنە دوو کۆمەڵ: کۆمەڵێك بۆ بەهەشت کە باوەڕدارانن، وە کۆمەڵێکیش بۆ ئاگری سووتێنەری دۆزەخ کە بێباوەڕانن. ژیان بەسەربردن لەم دوو شوێنە ڕوونە و سەرەنجام و پاشەڕۆژی دیاری کراوی هەیە کە مانەوەی هەمیشەییە، بۆ باوەڕداران و تاوانبار و بێبڕواکان.

---

[١] - سورەتی ال عمران ئایەتی (١٤٥).

[٢] - سورەتی الشوری ئایەتی (٧).




هەر کەسێك سەراپای ژیانی تاوان و دژایەتی دینی ئیسلام بێت، هەمیشە لە هەوڵی پیلان و تەڵەکەبێ بۆ موسوڵمانان، دڵی ڕەشبێ بەرامبەریان و سەرپێچی فەرمان و یاسای خودای پەروەردگار بکات، ئەوا خوای گەورە ئاگر دەکاتە شوێنی مانەوەی لە دوارۆژدا.
﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[1].
واتە: نەخێر وانییە، ئەو کەسەی گوناهو تاوان ئەنجام بدات و تاوانەکانی هەموولایەکی دابگرێت (ئاشکراو نادیاری) ئەو جۆرە کەسانە نیشتەجێی ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە.
بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوانەی تەمەنی خۆیان لە پێناو خودای گەورە و لەخزمەتی ئیسلام پیرکرد و هەموو غەمیان بۆ سەرخستنی بوو، گشت کاروکردەوەیەکی تەنها بۆ ڕەزامەندی خودا بوو بەدڵسۆزی و نیەت پاکی، ئەوە خوای گەورە پاداشتیان بە باشترین شێوە دەداتەوە لە دوارۆژ.
﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[2]. واتە: ئەو کەسانەش باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، هەر ئەوانن نیشتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر.
بڕواداری ڕاستگۆی شوێنکەوتەی سەر ڕاستی ئیسلام لە ژیانی دونیا بۆ سەرەنجامێکی نەبڕاوە تێدەکۆشێ، هەوڵ و تەقەلا دەکات لە پێناو خودای گەورە بەدڵسۆزی بۆ گەیشتن بە مەنزڵگای دوارۆژ کە بەهەشتە، چونکە دەزانێ بەمانەوە تێیدا ژیانێکی هەمیشەیی بۆ هەیە، لە بەرامبەر ژیانی دونیا کەبەردەوام لەبرسی بوون و نەبوونی و غەم و خەفەت دایە، بەڵێ بۆ ئەو بەهەشتە تێدەکۆشێت کە خۆشییەکانی و ڕابواردنەکانی بێ کۆتایین،

---

[1] - سورەتی البقرة ئایەتی (٨١).
[2] - سورەتی البقرة ئایەتی (٨٢).




هەروەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو بارەیەوە دەفەرمووێ:
عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ لَا يَبْأَسُ، لَا تَبْلَى ثِيَابُهُ وَلَا يَفْنَى شَبَابُهُ)[1]. واتە: (ئەبو هورەیرە) (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەس بچێتە بەهەشتەوە هەمیشە بەهرەمەند دەبێت و تەنگ ژیانی بەسەردا نایەت، نەجل وبەرگی دارزاو دەبێت و نەتاقی لاویشی بەسەر دەچێت.

بۆیە ئەزانێت ئەم دونیایە کاتییە و ڕۆژێکی لە پێشە دەبێ بگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە، بۆیە هەوڵدەدات هەمیشە بۆ سەرکەوتن و بەدەست هێنانی بەهەشت تێ بکۆشێت، چونکە زانیویەتی خوای گەورە پەیمانی داوە بەوانەی کە تەنها بەندایەتی بۆ ئەو دەکەن بەهەشت و نازو نیعمەتەکەی دەکاتە خەڵاتییان.

هەر بۆیە ئەهلی بەهەشت، کە چوونە ناو بەهەشت، دەپرسن لە ئەو کەسانەی لە دونیا دژایەتی خوای گەورەیان دەکرد، گاڵتە و ئیهانەیان دەکرد بە ئیسلام و موسوڵمانان، باوەڕیان بە قیامەت و مردن و زیندوو بوونەوە نەبوو، فەرمانەکانی خودایان پشتگوێ خستبوو لە پێناو ڕابواردنەکانیان، پێیان دەڵێن: ئایە خوای گەورە ئەو بەڵێنەی پێدابوون لە دونیا کە بەندایەتی بۆ نەکەن و پابەندی بەرنامەی ئیسلام نەبن و دژایەتی بکەن ئەوا شوێنتان ئاگری دۆزەخ دەبێ!

ئایە گەیشتن بەو پەیمانەی خودای کارزان کە لەدونیا پێی ڕاگەیاندن جێگا و مانەوەتان ئاگری دۆزەخ دەبێ ؟!

ئێمە وا گەیشتین بە خەڵاتی خۆمان لەسەر ئەو ماندوبوونەی دونیا چێشتمان بۆ ئەو کاروکردەوانەی خودای گەورە فەرمانی پێکردین بەکردنیان، وا لە بەهەشتین بەلێنی خوای گەورە ڕاست و حەق بوو پاداشتی خۆمان وەرگرت کە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتە.

[1] - (صحيح مسلم - الجنة وصفة نعيمها وأهلها، ژمارەی فەرمودە: (٢٨٣٦).

﴿وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾[1]. واتە: پاشان نیشتەجێیانی بەهەشت بانگی نیشتەجێکانی دۆزەخیان کرد: بەڕاستی ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارمان پێی دابووین دەستمان کەوت و پێی بەخشین، ئایا ئێوەش ئەو بەڵێنەی کە پەروەدگارتان دابووی بەڕاستی دەستان کەوت؟! (لە وەڵامدا بەدڵ شکاوی و غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە) گوتیان: بەڵێ.. ئەوسا جارچیەك جاڕیدا لە نێوانیاندا و هاواری کرد: نەفرەتی خوا لە ستەمکاران بێت.

بەڵێ ئەو کەسەی ژیانی خۆی بۆ خزمەتی دینی خوای گەورە تەرخان کردبوو، خەمی ئەو بۆ ماڵی دونیا و خۆشیەکانی خانووی کامڵ مواسەفات و سەیارەی مۆدێل بەرز، بوون بە خاوەنی کارگە و شوقە و شوێنی سیاحی و گەشتیاری نەبوو، بەڵکو غەم و خەفەتی ئەو لە دونیا ئەوەبوو نەکەوێتە ژێر توڕە بوونی خودای گەورە، بە پێشێلکردنی فەرمانەکانی.

بۆیە هەمیشە هەوڵ دەدات بە دڵسۆزی و نیاز پاکی عیبادەت و بەندایەتی بۆ خوای گەورە ئەنجام بدات، زەخیرەی چاکە و ئیحسانی بە خشوع و تەقوا لە قوتابخانەی ئیسلام بۆ پاشەڕۆژی ڕەوانە بکات تا سەرفرازی مسۆگەر بکات، گەر خاوەنی هیچ نەبێ لە دونیا ژەمە خواردنێکی خۆش یا سیسەم و قەنەفەو کورسی بەرز و نەرم، سەیارەو خانووی چەندان قاتی بەڵکو خانوویەکی هەبێ بیپارێزێ لە سەرما و گەرما ڕایەخێکی تێدابێ لەسەری دابنیشێ تەواو، بۆیە لای خودا بەرنادات هەمیشە بەندەی خودایە، ئەم جۆرەکەسانە سەرەنجامیان لای خودای بەرز و مەزن تەنها بەهەشتە.

[1] - سورەتی الاعراف ئایەتی (٤٤).




﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَخْبَتُوا إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[1]. واته: بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەخواو ڕاستی بەرنامەکەی، کردەوە چاکەکانیشیان ئەنجامداوەو گەڕاونەتەوە بۆ لای پەروەردگاریان و ملکەچ و دڵ ئارام بوون لە بەرامبەر فەرمانەکانی، ئا ئەوانە خاوەن و نیشتەجێی بەهەشتن و بە هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە.

بۆیە ئەی بەندەی خودا بزانە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە دەبێت هەوڵی بۆ بدەین، تەنها قسە نەبین بەبێ کردەوە، بەڵکو دەبێ کردەوەشمان هەبێت، تاوەکو بەهەشت بەدەست بێنین، بزانە چۆن خوای گەورە باسی ئەوانە دەکات، کە لە بەهەشت گفتوگۆ دەکەن لەگەڵ یەکتری، کە لە دونیا چۆن بۆ خودا ژیان چەن ئەزیەت و ناڕەحەتیان چەشتوەو، چەند ماندوو هیلاك بوون، ئازار دەدران لەسەر دینی ئیسلام و دەربەدرو بزردەکران لەبەر ئەوەی تەنها بەندەی خودای گەورە بوون.

﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾[2]. واتە: وە هەندێك لە بەهەشتییەکان ڕوو ئەکەنە هەندێکیان وە پرسیار لە یەکتری ئەکەن دەربارەی کردەوەکانی دونیایان.

بەڵێ دەربارەی کردەوەکانیان قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن کە لە دونیا کە کردوویانە بۆ خودای گەورە، خۆزگە دەخوازن خزم و دۆستەکانیان ڕێگای ڕاستیان گرتبایە بەر، تاوەکو ئەوانیش لەوخۆشیەی بەهەشت لەگەڵیان بونایە، بەڵام ئەوان گوێنەدار بوون بۆ بەرنامەی ئیسلام بۆیە سەرەنجامی خۆیان وێران کرد.

﴿قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ﴾[3]. واتە: سەرەنجام هەموو بەیەک دەنگ دەڵێن: بەڕاستی ئێمە پێشتر لەناو کەسوکاری خۆماندا لە دونیادا لە سزای خوای گەورە ئەترساین، هەروەها بەبەزەییش بووین لەناویاندا و مەبەستمان بوو ئەوانیش وەك ئێمە خودناس بن.

---

[1] -سورەتی هود ئایەتی (٢٣).
[2] - سورەتی الطور ئایەتی (٢٥).
[3] - سورەتی الطور ئایەتی (٢٦).




ئیماندراران لە دونیا کاتێك خوای گەورە بیری خەڵك دێننەوە، کە دووربن لە تاوان و سەرپێچیکردنی فەرمانی خودای گەورە، بۆ ئەوەیانە تاوەکو گشت خەڵکی دووربن لەسزای پڕ ئێش و ئازاری دۆزەخ ڕزگاریان بێت و بەهەشت شوێنی مانەوەیان بێت.

﴿فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ﴾[1]. واتە: بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە نیعمەتی خۆی ڕژاند بەسەرماندا وە لێمان خۆشبوو وە ڕەحمی پێ کردین‌و پاراستمانی لە سزای ئاگری دۆزەخ کە سزایەکە چۆن بایەکی گەرم هەڵ ئەکات بەو شێوازە گەرمییەکەی یەکجار سەختە.

بۆیە تاکو گەنجین و توانامان هەیە با لە خەوی غەفڵەتی ژیانی دونیا بە ئاگابێینەوە، ڕێگای ڕاستی ئەم ئیسلامە پاکە بگرین، کە تاکە ڕێگایە بۆ خۆشبەختی هەردوو دونیا، تاوەکو سەرەنجامان بەهەشتی خۆشی پڕ لەنازو نیعمەت بێت، با لە دونیا تەنها لای خوای گەورەمان هەبێت بۆ ئەو بژین بەڕاست و دروستی، بۆئەوەی لە دوارۆژ لەوانەبین کە بەرێ دەکرێن بۆ دیداری خوای گەورە.﴿ يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴾[2]. واتە: ڕۆژێك دێت ئێمە دەستە دەستە خواناس و پارێزگاران بۆ لای خوای میهرەبان بە ڕێ دەکەین تا بەدیداری شادبین و بیانخاتە بەهەشتەوە.

با لەو کەسانە نەبین کە بەرەو ئاگری سوتێنەری دۆزەخ دەیان بەن، بەهۆی گرتنە بەری ڕیگای گومڕای و دژایەتیان بۆ بەرنامەو یاسای خوای گەورە و زۆری تاوانیان لە دونیا.

﴿ وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾[3].واتە: خراپەکارو گوناهکارانیش بەپەلەو بەتینویەتی ڕاپێچ دەکەین بۆ ناو دۆزەخ.

[1] - سورەتی الطور ئایەتی (٢٧).

[2] - سورەتی مریم ئایەتی (٨٥).

[3] - سورەتی مریم ئایەتی (٨٦).





بەڵام ئەوانەی گشت تەمەنیان لە ژیانی دونیا بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بردە سەر، هەموو کات غەمیان جێبەجێ کردنی فەرمان و بەندایەتی بوو بۆ خودای پەروەردگار، ئینجا کاتێك دەچن بەرەو بەهەشت دەڵێن:

﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاءُ فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾[1]. واتە: ئەوسا ئیتر ئەو بەختەوەرانە دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی، کە بەڵێنی خۆی بۆمان بردە سەر و کردینی بەخاوەنی سەرزەمینی بەهەشت و لە هەرشوێن و لە جێیەکیدا بمانەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینە سەر، ئای چەندە پاداشتی تێکۆشەران و خەباتکاران چاك و پاك و بەنرخە.

بۆیە ئەی بەندەی خودا تاکو نەمردوی و لە ژیانی زۆر ئاگاداربە فرسەتە بۆت، نەکەی سەرەنجامت وێران بکەی بە دژایەتی کردنت بۆ ئیسلام و موسوڵمانان، نەکەی چرکەیەك لەژیانت بەهەدەر بدەی بۆ خودات نەبێت، نەکەی وا لە دڵت بکەی مەیلی دونیا بکات و وات لێبکات دووربکەویتەوە لە ڕێگای ئیسلام، تاکو زووە خۆت ئامادەی ئەم سەفەرە دوورو درێژەی دواڕۆژ بکە، جانتای سەفەری دواڕۆژت با لەشانت بێت و دای مەنێ پڕی بکە لە کاروکردەوەی چاکە بۆ ئەو ڕۆژەی کەس سوودی بۆ کەس نیە و بەهانای کەسەوە ناچێت، تاکو ئەو کردەوە چاکانەت لە قیامەت بۆت ببێتە توێشو و پشت و پەنا تا ڕزگارت بێت لە ئاگری دۆزەخ و جێگای مانەوەی هەمیشەییت بەهەشتی فیردەوس بێت، بە ئیزنی الله تعالی.



[1] - سورەتی الزمر ئایەتی(٧٤).





# تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و پیلانی ڕۆژئاوا!!

دووژمنانی ئیسلام بە درێژای مێژوویان هەمووکات هەوڵیان داوە دژی بەرنامەی ئیسلام بوەستنەوە، یەکێك لە پیلانەکانیان بریتیە لە ئەنتەرنێت و تۆڕەکۆمەلایەتیەکانی وەك، فەیسبوك، ئینستگرام، تێلگرام، تویتەر، سناپ چات ...هتد.

کە ژیانی خەڵکی و بەتایبەت موسوڵمانانی شێواندووەو، خۆشی و ئاسوودەیی چەندین ماڵی لە ناوبردوە، ژیانی چەندەها خێزانی لێك جیاکردۆتەوە، شەرەف و ئابڕوی زۆرێك لە ئافرەتانی وەک خەڵوز ڕەش کردووەو ،شکۆ و شەرمیانی شکاند و کردنی بەقوربانی حەزو ئارەزوەکانی گەنجە کوڕە سەر لێ شێواوەکان، وە بووە هۆی دوورخستنەوەی موسوڵمانان لە دینەکەیان و ساردکردنەوەیان لە بەندایەتیان بۆ خودای گەورە.

فەیسبوك و تۆڕەکان لە ئێستادا ڕێژەی بەکارهێنانیان گەیشتۆتە ئاستێکی زۆر بەرز، زۆربە ئاسانی هەموو کەس دەتوانێ بەکاریان بهێنێت، ئافرەتانیش پشکی شێریان بەرکەوتووە لەو ڕێژەیە، وە یەکەم چینن کە توشی زەرەرو زیان دەبن، بەداخەوە خوشکان لە تۆڕەکانیش خۆیان ناپارێزن هەر خەریکی بڵاوکردنەوەی وێنەی سەرنجڕاکێشن بەدەستی خۆیان کێشە و ئاژاوە بۆخۆیان دەنێنەوە، چونکە گورگەکان بەهەموو شێوەیەك بەدوای نێچری خۆیان دەگەڕێن، هەر مەڕێکیش چەن خۆی بەدەر بخات زیاتر دەبێتە نێچر و قوربانی دەستی گورگەکان، بۆیە زۆر پێویستە خوشکان هەموو کات پارێزی بکەن لەخۆیان لە تووش بوونیان بە گورگەکان لە هەموو شوێن و کاتێکدا لەبازاڕ، دەوام، زانکۆ، تاکو نەبنە قوربانی.

هەندێك لە گەنجان ڕێگای چات و نامە بەکاردێنن بۆ زەواج و یەکتر ناسین، بەڕاستی هەڵەیەکی زۆر گەورەیە کە چات بەکاربێنی بۆ زەواج، چونکە کەس لە فەیسبوك و تۆڕەکان نازانێ ئەو کەسە کە بۆتە هاوڕێی کێیە و چۆنە، ئەخلاق چۆنە، چونکە هەموو کەس دەتوانێ خۆی بە کەسی باش پیشان بدات، لەپشت لاپتۆپ و مۆبایل،





تاوەکو کەسی بەرامبەر هەڵبخەڵتێنێت، کەچی لەڕاستیدا گورگەو خۆی حەشارداوە لە پێستی مەڕ !

کەسی وا هەیە ژن و منداڵی هەیە ترسی خودای گەورە لە دڵی نیە، پەیوەندی لەگەڵ دەیان ئافرەت هەیە، بۆ کات کوشتن و ڕابواردن و خۆشی نەفسی هیچ مەبەستی تری نیە، بەدرۆ بەناوی زەواج هاوڕێیەتی لەگەڵ ئافرەتان دەبەستێ، ئافرەتانی ئێستاکە زۆرینەیان زۆر ساویلکەو خۆش باوەڕن، لەگەڵ ڕێزم بۆ ئافرەتە باشەکان زوو باوەڕ دەهێن بەقسەی گەنجەکان، بۆیە بەقسەی باق و بریقی عاتفی هەڵیان دەخەڵتێنێ بۆ مەبەستی خراپ، ئەو گەنجە داوای وێنە و یەکتر بینین دەکات، کە بیبینێ تاوەکو بڕیاربدات بۆ زەواج، کە وێنەی نارد زیاتر قسەی بریقەداری بۆ دەکات، تاکو دڵی ئافرەکەتە نەرم بکات، بۆئەوەی زیاتر هەڵی خەڵتێنێت، پاشان داوای یەکتربینینی ڕاستەوخۆ دەکات لە شوێنێك بەتەنها!، بە هەر جۆرێك بێت ئافرەتەکە ڕازی دەکات، کە یەکتربینن پاشان پەیمانی زەواجی لەگەڵ دەدات، ئافرەتەکەش نازانێ زۆر ساویلکەیە زوو بڕوای پێدەکات، نازانێ کابرا خێزان و منداڵ و ماڵی هەیە، ئینجا کابرا بەڵێنی خۆشترین ژیانی پێدەدات و کە بووە هاوسەری، بە فێڵ خۆی زۆر لێ نزیك دەکات، کارت و وەحدەی بۆ دەنێرێ و بەکەسی دڵسۆز خۆی نیشانی دەدات تا متمانەی ئافرەتەکە بەدەست دێنێ، تاکاتێك زۆر لێی نزیك بوو ئینجا پەیوەندیەکە دەگاتە تاوان و زینا ئەنجامدان پەنا بە خوای گەورە، ئینجا وێنەی نیمچە ڕووتی لێدەگرێ و دواتر دەگاتە ئاستی هەڕەشە لێکردن، کە دەبێ ئەو ئافرەتە لەژێر فەرمانی خۆی بێت، هەموو جار بە ئارەزووی خۆی ئەو ئافرەتە ببات خۆشی خۆی پێ بەتاڵ کاتەوە یان داوای پارەی لێ دەکات و ئەگەر بەگوێی نەکات وێنە و ڤیدۆکانی بڵاودەکاتەوە، حەیا و شەرم و شکۆی دەشکێنێ بە کوشتنی دەدات.

چەندین کچ و ژن دەرکراون لە ماڵ، نێردراون بۆ شوێنی داڵدەدانی ئافرەتان لەلایەن باوك و براو خزمەکانیان، چونکە لای خەڵك حەیاو شەرەفیان چووە، کە ژن و کچ و خوشکیان چ کارێکی ئابڕو بەرانەیان کردووە و پێیان کراوە.





برۆ بۆ دادگاکان بپرسە بزانە چەندین سکاڵا تایبەتە بە کێشەکانی فەیسبوک و چاتەکان، زۆربەی کچ و ئافرەتانی ئەم سەردەمە زۆر ساویلکەو خۆش باوەڕن، زوو بەقسەی کوڕ هەڵدەخەڵەتێن و باوەڕیان پێدەکەن، بە دوو قسەی باق و بریقی ئاشقانە وادەزانێ خۆشی دەوێ، نازانێ دەیەوێ بیکاتە پارووبەکی چەور و نێچیر و ڕاوی بکات، بیخاتە ژێر دەستی خۆی بە ئارەزووی خۆی یاری پێ بکات.

گەنجانی ئەم سەردمە زۆربەیان بێ ئیش و کارن هەر بەردەوام کاتیان بە ئەنتەرنێت بەسەر دەبەن، دەیانەوێ کچ و ئافرەتان هەڵخەڵەتێنن، هیچ کاری تریان نیە بە فەیسبوك و ئەنتەرنێت جگە لە ڕابواردن و کات بەسەر بردن.

ئامۆژگاریمان بۆ باوك دایکانە زۆر ئاگاداری منداڵەکانیان بن، ڕێگە نەدەن منداڵەکەیان فەیسبوك و ئەنتەرنێت بەبێ چاودێری بەکار بهێنن، بەڕاستی بەداخەوە ئێستا منداڵی واهەیە تەمەنی دە (١٠) ساڵە فەیسبوکی هەیە، تاوەکو بەجوانی پەروەردەی بکەی بە ئیمان و ئەخلاقی ئیسلامی تاکو لە دوارۆژ کەسێکی چاکی لێ دەربچێ و دوعات بۆبکات لە پاش مردنت، بەڵام حەیف بۆ باوکان و دایکان خۆیان نەزانن بە دینی خوای گەورە، هەر لەبەر تیڤی و فیلمی تورکی دوور لە ڕەوشتی جوانی ئیسلام کات بەسەر دەبەن بێ ئاگان لە کوڕ و کچیان کە خەریکی چین لە ئەنتەرنێت!، ڕۆژێك ئامۆژگاری منداڵەکانیان نەکردووە زۆربێ خەمن لە ئاست پەروەردەو چاودێری کردنیان، گەر هاتوو باوك و دایك پەروەردەیەکی جوانی ئیمانیان فێری منداڵەکەیان کرد ترسی خوای گەورەیان خستە دڵی کە هەمیشە چاودێرە بەسەرمانەوە، هیچ کات ئەو منداڵە خراپە و تاوانێك ناکات لە نهێنی و ئاشکرا، کە ببێتە هۆی ئابڕوچوونی ماڵەوەیان.

ئەنتەرنێت و فەیسبوك ڤایرۆسێکی زۆر کوشندەو زیان بەخشن ئەگەر لێی نەزانین چۆن بەکاریان دەهێنین، چونکە هەر کەسێك ئالودەی بوو ناتوانێ وازی لێبێنێ، پاشان کاتێکی زۆر لە مرۆڤ دەکوژێ. بزانە ئەی موسوڵمان ڕەحمەتی خوات لێبێت، ئەنتەرنێت و فەیسبوك و باقی تۆڕەکان هەمووی فیکری رۆژئاوایە لە ژێر دەستی خۆیانە





دژی بەرنامەی خوای گەورە بەکاری دێنن، دەیانەوێ خۆیان حوکمی هەموو جیهان بکەن، دەسەڵاتیان بسەپێنن بەسەر تەواوی موسوڵمانان، بۆیە ئەم فەیسبوکە پرۆژەی رۆژئاوایە، هەموو ئاوات و خۆزگەیەکیان ئەوەیە موسوڵمان غافڵ و بێئاگا بکەن لە دینەکەیان، چونکە گەر هاتوو موسوڵمانان شارەزای ئیسلامەکەیان بوون بە ڕاست و دروستی هەروەك خوای گەورە پێی ڕازییە بەندایەتی بکرێت، ئەوا موسوڵمانان هەوڵی بڵاوکردنەوەی دینەکەیان ئەدەن بەگشت جیهان تاوەکو حوکم بکات بە دادگەری و یەکسانی و خۆشبەختی بۆ گشت مرۆڤەکان دەستەبەر بکەن، بەڵام رۆژئاوا هەموو کات لە سەنگەرە بۆ دژایەتی بەرنامەی خوای پایەبەرز، دەیانەوێ نور و ڕوناکی ئیسلام بکوژێننەوە بەڵام ئاواتەکانیان نایەتە دێ.
﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلَّا أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾[1].
واتە: ئەوانە بەو بیروباوەڕە پووچانەیانەوە دەیانەوێت نوور و بەرنامەی خودا بەقاڵەی دەمیان بکوژێننەوە و خامۆشی بکەن (بەڵام خەیاڵیان خاوە) خودا ناهێڵێت ئاواتیان بێتە دی و هیچ شتێکی تری ناوێت جگە لەوە نەبێت ئاین و نووری خۆی سەربخات و نووری خۆی تەواو بکات و دەری بخات، هەرچەندە کافرو بێ باوەڕان پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن بەوەی دینی خودا لەگشت لایەك بڵاوبێتەوە.
بەڵێ ئەهلی کوفر هەموو کات دەیەوێت بیروباوەڕ و فیکری بۆ گەنی ناتەواویان، کە ئارەزووی نەفسی خراپەکاریانە دەسەڵاتدار بێ بەسەر گشت جیهان، بەڵام خەیاڵی ناپوختیان خاوە ئیسلام هەمووکات لە زیادبوون و گەشەکردنە سوپاس بۆ خودا، خوای گەورە پیلانەکەیان فەشەل پێدێنێت بەوەی زەوی لەژێر دەستیان بێت ئاواتیان نایەتەدێ هەر ئیسلام سەر بەرز ئەبێ ئەگەر چی کاتی زۆریش بخایەنێت.

---

[1] - سورەتی التوبة ئایەتی (٣٢).

﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾[1]. واتە: دوژمنانی خودا پیلانیان گێڕا، خوایش پیلانەکانی پووچ کردنەوە، چونکە خودا چاکترین و بەدەسەڵاترین زاتێکەلە هەڵوەشاندنی نەخشە و پیلانی دوژمنانیدا.

ئەوەش شایەتی یەکێك لە قەشە خاچ پەرستەکانیانی خۆیانە، کە دان دەنێت بەو ڕاستییەی کە بەرنامەی ئیسلام لە هەموو سەر زەوی بڵاو دەبێتەوە، قەشەکە لە کورتە ڤیدۆییەك دەردەکەوێت و قسە دەکات لە کەنیسە بۆ شوێنکەوتوانیان، دەڵێ: سبەی فەرەنسا دەبێتە وڵاتێکی ئیسلامی، ئەو منداڵانەی لێرە دانیشتوون لە داهاتوو دەبنە موسوڵمان و تەواوی جیهان دەبنە شوێنکەوتوی ئیسلام.

بزانە چۆن ترسیان لێ نیشتوە لەوەی مەسیحیەت خەریکە دەڕوخێ بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە هەموو ئەورووپا، ئینجا هەڕەشە ئەکات دەڵێ: پلان دائەنێم بۆ دژایەتی موسوڵمانان و ڕێگری دەکەم لە بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام.[2]

بەڵێ ئەوان بەردەوام خەریکی دانانی پڕۆژەو بەرنامەن بۆ تێکدانی ئەخلاق و ڕەوشتی موسوڵمانان، بۆ غافڵکردن و گومان خستنە دڵیان لە ڕاستی و حەقیقەتی دینی ئیسلام، چونکە باش ئەزانن ئیسلام ئاینی عەدالەت و یەکسانییە، گەر لە هەر شوێنێك حوکم بە یاسای خودای گەورە کرا خۆشترین ژیان بۆ مرۆڤەکان فەراهەم دێنێت، بەڵام ئەوان قبوڵی دینی خوای گەورە ناکەن، چونکە دەیانەوێت مرۆڤ وەك ئاژەڵ تەنها بۆ شەهوەت و ڕابواردن بژیت، مرۆڤەکان هەموو کۆیلەیان بن و گشت شتێك لە ژێر دەستی خۆیان بێت، هەموو کەس ئازادە بە ئارەزووی خۆی دەست بۆ شەرەف و ناموسی خەڵك درێژبکات، ئافرەت ڕووت بکرێتەوە و لەشفرۆشی بکات، یاخود سەیری تیڤی بکە هەموو فیلمی نیمچە ڕووت و ئاشقانە پەخش دەکەن بۆ ئەوەی شیرازەی خێزان تێکبدەن.

---

[1] - سورەتی ال عمران ئایەتی (٥٤).

[2]- سەرچاوەی ڤیدۆکە لەم لینکەوە ( https://youtu.be/yYkuhvggPxQ )





تاکو کۆمەڵگای موسـوڵمانان چاویان لێبکەن و بەدووای ڕێچکەو ڕێبازیان بکەون، بەڵێ کاریـان تـەنها بڵاوکردنـەوەی بەدڕەوشــتییە لـەگشــت کون قوژبنێکی وڵاتـانی موســوڵمان، چونکە ڕێگایەکە زۆربەی خەڵکی بەدوایەوەن ئەیانەوێت بۆ خۆشــی ڕابواردن بژین بۆیە زوو گومڕادەبن پەنا بەخودای گەورە.

تۆڕی فەیسبوکیش یەکێکە لە بەرنامە بۆ داڕێژراوەکانی جوولەکەو خاچ پەرستەکان، خاوەنی کۆمپانیای فەیسـبوك ناوی (مارك زوکرە) کەسـێکی جوولەکەی مولحیدە، لە شــاری نیۆرك لە خێزانێکی یەهودی لە دایك بووە، بنکەی ســەرەکی کۆمپانیاکەش لە ئەمریکایە لە ویلایەتی کالیفۆرنیایە.[1]

بۆیـە ئیمانـداران ڕەحمـەتی خوداتـان لێبێـت، وریـابنـەوە لـە پلان و فێڵی بێ باوەران، وامەکە بە هۆی ئەم فـەیســبوکەوە دین و دونیات بدۆڕێنی، بەڵکو هەوڵبدە لە کاری چاکە بەکاری بێنە بیکە مینبەرێك بۆ بانگەوازی دینی خوای گەورە، خەڵکی ئامۆژگاری بکە بۆ سەر ڕێگای ئیسلام، گەر زمان دەزانی ئینگلیزی، فارسی، ئیسپانی، روسی ..هتد بەو زمانە ئیش بکە بۆ قیامەتت، هیدایەت دانی کەسـێك بە هۆی تۆ وە باشــترین دەســکەوتە لـە دونیا و قیـامەتدا. هـەروەك پێغەمبەری خۆشـەویسـتمان (ﷺ) ئامۆژگاری ئیمامی (علی کوڕی ئەبوتالیب) (ڕەزای خوای لێبێت) دەکات.

(فَواللَّه لأَنْ يَهْدِيَ اللَّه بِكَ رَجُلاً وَاحِداً خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمَ)[2]. واتە: ســوێند بەخودا ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە یەك کەس ڕێنمایی بکات بۆ تۆ چاکترە لـە هەرچی وشــتری سوور هەیە (مەبەست سامانی دونیایە).

بۆیـە بـا هـەموو هـەوڵ و تـەقـەلات لـە دونیـا بۆ بـانگەوازی دینی خوای گـەورە بێ، لـە ماڵەوە، لەدەرەوە بازاڕ، زانکۆ، فەیســبوك، توێتەر، یوتوب، هەرچی ڕێگا بوونی هەیە هەموو بخە خزمەت بانگی مرۆڤایەتی بۆ بەرنامەی ئیسلام،

---

[1] - سەرچاوە https://ar.wikipedia.org/wiki/مارك_زوكربيرغ

[2] - صحيح البخاري، ژمارەی فەرموودە: (٢٩٤٢). صحيح مسلم، ژمارەی فەرموودە: (٢٤٠٦).

باتۆش بەژداربی لەو خێرە نەبڕاوەیە، سـوێند بەخوای گەورە، گەر کەس نەبێ غەم لە دینی ئیسلام بخوات، بێکەس بمێنێتەوە ئەم ئیسلامە هەر سەردەکەوێ بەسەر گشت یاساو شەریعەتەکانی دونیا، ئەگەر چی دونیا هەموو دژایەتی دینی خودای کارزان بکەن ئەمە بەڵێن و پەیمانی خوای گەورەیە هەروەك دەفەرمووێـت:﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْـرِكُونَ﴾[1]. واتە: هەر ئەو زاتە بۆیە پێغەمبەرەکەی هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئایینی ڕاسـت و دروسـتدا ڕەوانە کردووە تا سـەری بخات بەسـەر هەموو بەرنامە و ئاینەکانی تردا، هەرچەندە موشریك و هاوەڵگەران پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن.

بۆیە ئەی برای من خوشـکی بەڕێزم بزانە ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتی و فەیسـبوك و چاتانە هیچ سـوودی نییە بۆمان، هەموو کات کوشـتنە لەخۆمان، تەمەنمان لێ بەفیڕۆ ئەدات ئەگەر بۆ خزمەتی بەرنامەی خوای گەورە بەکاری نەهێنین، چونکە ڕێگایەکی زۆر چاکە بۆ بانگەوازی ئەگەر لێزانی و حیکمەتت هەبێ، ئەتوانی کەسـێك لەو پەڕی دونیا بیخەیتە سەر ڕێگای ئیسلام و موسوڵمانی بکەیت.

ئەگەر بۆخوای گەورەش نەبێت با ناوبانگت دەربکات هەموو خەڵکی بتناسـن و چاودێریت بکەن کەتۆ مردبی کەس نیە ئاکاونتەکەت بکاتەوە، کەشـتی خراپ و بێسـوودی دوور لەدینی خوای گەورەت بلاوکردبوویەوە، هەتا دوارۆژ خراپەت بۆ دەنوسرێ هەرکەس سـەیری بکات و شـتەخراپەکانت بۆخۆیان بلاوکەنەوە، بۆیە شـتی بەسـوود بۆ دونیا و قیامەتت بلاوبکەوە، تاکو دوای مردنیشـت هەرکەس سـەیری ئاکاوەنتەکەت بکات ئیمانی بەرزبێتەوە خوای گەورەی بیر بێتەوە.

کەوابوو ئەی بەندەی خودا بۆ گشـت کارێکی چاکە و چاکەکاری مەردانە فۆلی لێ هەڵبکە و دەسـت پێشـخەربە، تا لە دونیاو قیامەت پلەت بەرزبێتەوەو، لە دواڕۆژیش بەهەشتی فیردەوس شوێن و مەکانت بێت، بەئیزنی الله تعالی.

[1] - سورەتی التوبة ئایەتی (٣٣).







# زۆربوونی تەڵاق و چارەسەری!

یەکێك لەو دیاردە خراپانەی کە بەڕادەیەکی زۆر لەگەشــە دایە جیابوونەوەی هاوسەرانە، چەندین هۆکارمان هەیە لەم ڕۆژگارە کەبووەتە هۆی زۆری ڕێژەی تەڵاق.
لەگەڵ پێشــکەوتنی تەکنەلۆژیا و زۆر بوونی کەناڵە ئاســمانیەکان و بڵاوکردنەوەی ئەفلامە دۆبلاژکراوەکانی ڕۆژئاوا کە بۆتە هۆی فەســادی و زۆر بوونی بەدڕەوشــتی و خراپەکاری، ئینجا چاولێکەری خەڵکی لە ئەکتەر و کەســانی دوور لەدینەکەی خوای گەورە، کە بۆتە هۆی سارد و سڕی پەیوەندی نێوان هاوسەران، بۆیە هیچ سەردەم و کاتێك وەکو ئێستا ڕێژەی تەڵاق زۆر نەبووە لە کۆمەڵگەی موسوڵمانان.
وە یەکێکی تر لەهۆکاری ســەرەکی زۆر بوونی تەڵاق دوورکەوتنەوەی موســوڵمانانە لە دین و بەرنامەکەی خوای گەورە کە ئیسلامە، چونکە کاتێك کێشــەیەك تووشی ژن و پیاو دەبێت نازانن هانا بۆ کوێ ببەن!، بە هۆی نەشارەزابوونیان بە ئیسلامەوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان هەوڵیان نەداوە فێری شــەریعەتی خودای گەورە بن، فێری چۆنیەتی هەڵســوکەوت لەگەڵ یەکتری بن بەچاو لێکردنی ســەر مەشــقی ڕەوشــت بەرزان پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە چۆن جوانترین ڕەوشتی بەرامبەر خێزانەکانی بەکار هێناوە .
زۆرێك لە پیاوان و ئافرەتان سەرەتای هەڵبژاردنی ئەوکەسەی دەیەوێت لەگەڵی بژیت، بۆ ژیانی هاوســەری تەنها لەبەر جوانی بووە، یاخود چاو شــین بووە، یا باڵابەرز بووە، یان دەوڵەمەند بووە، یان خاوەنی کۆمپانیاو کوڕی مەســئول بووە، ناوبانگ و پلەو پۆســت هەبووە ...هتد ئەمانە و چەندان هۆکاری تری دونیاییان مەبەســت بووە، بۆیە ئەم مەرجانە نابنە هۆی ژیانێکی خۆش و بێ کێشــە ئەگەر ئیمان و تەقوای خودایان نەبوو، لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردووین گەر ویســتان هاوسەرگیری بکەن، تەنها دین و ئەخلاق بەسەر گشت مەرجەکانی تر هەڵبژێرن.





عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ)[1]. واتە: لە (ئەبو هورەیرەوە) (ڕەزای خوای لێبێت) ئافرەت بۆ چوار مەبەست مارە دەکرێ: بۆ ماڵەکەی، بۆ ناوداریەکەی، بۆ جوانیەکەی، بۆ دینەکەی، جا تۆ دیندارەکە بخوازە و دەستت بچێت بە خێردا.

ئەو مارەکردنەی لەسەر بنەمای ڕەوشتی جوان و تەقوا و لە خوداترسان بێ پڕ خێرو خۆشی و بەرەکەتە، ئەگەر یەکێك ئافرەتێك لە پێناو دینداریەکەی بخوازێت هەرگیز زەرەرمەند و ڕەنج بە خەسار نابێت.

بەڵام ئەگەر مەبەستێکی تری جگە لە دینداریەکەی هەبوو وەك ئەو مەرجانەی لەسەرەوە باسمان کرد، ئەو کاتە وەك ئەوە وایە بەسەر دەستەکانی کەوتبێتە سەر زەوی و بێ چارە دەبێ و پەشیمانی دادی نادات، چونکە کەسی دیندار و لە خواترس تێگەیشتوو ترە لە واقعی ژیان و پەروەردەی ئیسلامە، ناتوانێ خراپە و ستەمی بەرامبەر بکات تەنانەت لە بچووکترین شتیش، بۆیە ژیان بەسەر بردن لەگەڵی بەختەوەری و خۆشی دێنێتە ئاراوە. بەڵام لەم سەردەمە فێڵاویەدا خەڵکی بەگشتی بەدوای مەبەست و خۆشیەکانی دونیاوەن، هیچ غەم و پەژارەیان بۆ قیامەت و ئاخیرەتیان نیە، هەر ژیانی خۆشبوو گوێناداتە هیچ کەس، پشت لە عیبادەت و خواپەرستی دەکات، بۆیە هیچ کات دڵخۆش و بەختەوەرنین و بێزارن هانا دەبەن بۆ تەڵاق و جیابوونەوە.

بۆیە ڕەحمەتی خوای گەورەتان لێبێت، ئەی خێزانە بەڕێزەکان بگەڕێنەوە بۆ قوتابخانەو مەڵبەندی ئیسلام، خۆتان لێیەوە ناونوس بکەن، وانەی پەروەردەو ڕەوشت بخوێنن تاوەکو سەرفراز و بەختەوەر بژین، دەبێت پیاو و ئافرەتانی موسوڵمان ئاقڵ و ژیرانە لەگەڵ یەکتری هەڵسوکەوت بکەن، گەر یەکێکیان سەرپێچی کردو سنوری شکاند ئەوی تر ئامۆژگاری بکات و وریای بکاتەوە لە هەڵەکانی بە حیکمەت و لێزانین لەگەڵی بجولێتەوە بۆ ئەوەی ژیانیان بەختەوەر بێت.

---

[1] - رواه البخاري، ژمارەی فەرموودە: (٥٠٩٠).





لە ئێستا خەڵکی بەگشتی دوورن لەدینی خودای بەرز و مەزن، ئیسلامیان خۆشناوێت و چاکەی ئەویان ناوێ، بەڵام ئیسلام و بەرنامەی خودا خۆشی و بەختەوەری گشت بوونەوەری زەوی و ئاسمانیان دەوێت، بۆیە ئەگەر هاتوو هەرکەسێك دەستی بە ئیسلامەوە گرت، ئەوە سەرفراز و بەختەوەری هەردوو دونیا بەدەست دێنێت.

بەڵام بەداخەوە ڕێژەیەکی زۆر کەم لە موسوڵمانان پابەندی ئیسلامن و خۆشەویستی خودا پاشان قیامەت لایان لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە!، کەچی ئەوانی تر هەواو هەوس و ڕابواردن و خۆشی دونیایان دەوێت، بۆیە بۆ گەیشتن بە خۆشی و ڕابواردن هەموو شتێك دەکەن، غەدر، ناپاکی و غیانەت، جاسوسی، دووبەرکی خستنە نێوان موسوڵمان و، بڵاوکردنەوەی فەسادی و بێ ڕەوشتی، زوڵم و ستەمکردن، هەرچی خراپەیە ئەیکەن و ئەنجامی ئەدەن بۆ تێرکردنی نەفس و شەهوەتیان.

پیاو و ئافرەتانیش غەدر لەیەکتر ئەکەن لەوانەیە پیاوەکە یان ژنەکە یەکێکیان ستەم بکات لەبەرامبەرەکەی، پەیوەندی ناشەرعی لەدەوامەکەی یان لە فەیسبوك لەگەڵ کەسی تر هەبێت، کە ئاشکرابوو بۆیە قبوڵ ناکات پیاوەکە ژنی تەڵاق ئەدات، ژنەکەش داوای جیابوونەوە دەکات یان بەکوشتن ژیانیان کۆتایی پێ دێت.

هۆکاری تری زۆربوونی تەڵاق ئەوانەن کە بێ ڕەوشتی و بێ ئابڕوویی بڵاودەکەنەوە، بە بڵاوکردنەوەی فیلمی بەدڕەوشتی و نیمچە ڕووتەکانی دوور لە ڕەوشتی بەرزی جوانی ئیسلام وداب و نەریتی جوانی کۆمەڵگەی کوردەواری، ئەم فیلمانە چەندان ملیۆنی بۆ سەرف ئەکەن تا دۆبلاژی ئەکەنەوە بۆ کوردی کە هەموو پەروەردەیەکی ناپاك فێری هاوسەران دەکات، کە ناپاکی لەیەکتری بکەن و پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ گورگە خوێن خۆرەکان ببەستن، ئەو پارەی لەم فیلمانە بە هەدەر ئەڕوات بیاندایە بەگەنجەکان ژن بێنن قەیرەیی نەدەما، بۆیە پیاو و ئافرەتانی ئیماندار لەیەکتر قبوڵ ناکەن پەیوەندیان لەگەڵ کەسی تر هەبێ، بەڵکو دەیانەوێ تا مردن بۆ یەکتر بژین بەخۆشەویستیەکی پاك و بەبێ ناپاکی و فێڵ و زوڵمکردن لە یەکتری بەیەکەوە بن.







یاخود هۆکاری تری جیابوونەوەی هاوسەران زۆر لێکردنی ماڵەوەیە، کوڕەکە بەزۆر لە لایەن باوك و دایکیانەوە کچێکیان بۆ مارەکردووە، بەڵام خۆی بە دڵی نەبووە کاتێك ئەچنە نێو ژیانی هاوسەریەتی کوڕەکە هیچ کچەی ناکەوێتە دڵ، بۆیە هەڵسوکەوتی لەگەڵی خراپە و ساردو سڕە، کچەکەش قبوڵی ناکات پیاوەکەی پەیوەندی ساردو سڕیێت لەگەڵی، بۆیە ئەیکەنە کێشەو ناخۆشی تا دەگاتە ئاستی جیابوونەوە و تەڵاق.
بە هەمان شێوەش باوك و دایکی تر کچیان بە زۆر ئەدەن بەکوڕی مام و خاڵیان، کچەش بەدڵی نیە پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ کەسی تر هەیە، کاتێك دایان بەشوو بە زۆر لێکردن چووبە ناو ژیانی هاوسەریەتی ئەوکات هەر پەیوەندی هەیە لەگەڵ ئەو کەسەی خۆشی دەویست، بۆیە لەگەڵ پیاوی بەکێشە هەڵسوکەووت دەکات، بیستومانە کە کچە بەزۆر داویانە بە کوڕی مام، دوای مانگێك ژیان لەگەڵی یەکسەر بەجێی هێشتووە بە دوای خۆشەویستی کەوتووە بەهەموو زێرەوە!!
بۆیە ئامۆژگاریمان بۆ باوك و دایکان هیچ کات زۆر لە منداڵەکانیان نەکەن بۆ زەواج، بەڵکو پێویستە پێشتر پرسیان پێ بکرێت لە دیاریکردنی کەسەکان بۆئەوەی بە دڵی خۆیان بێت و لە داهاتوو بەختەوەر بژین. ئامۆژگاریشمان بۆ هاوسەرانی موسوڵمان کاتێك کێشەیەك دەکەوێتە نێوانیان خۆیان هەوڵ بدەن چارەسەری کەن و لەیەکتری تێ بگەن، نەك لای خزم و هاوڕێی باسی کێشەی خۆیان بکەن، دواتر بڵاوبێتەوە گوایە ژیانیان ناخۆشە و بەکێشەو ئاژاوە ژیان بەسەر ئەبەن، پاشان یەکتر تۆمەت باربکەن لەسەر ئەوەی کێشەی خۆیان لای فلان کەس باسکردووە. بۆئەوەی ژیانتان بەختەوەر و ئاسودەبێ خۆتان شارەزای ئیسلام و ژیانی پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ بکەن و ژیانی هاوەڵانی بەرێزو پیاو چاك و زانا و خواناسەکانی پێشین بخوێننەوە، چونکە بەڕاستی ئەوان نمونەی جوان و پێشەنگن لە ئەخلاق بەرزی و مامەڵەکردن لەگەڵ هاوسەرانیان.
ئەگەر بێت و سەیری ژیانی هاوسەرانی پێشینمان بکەین چۆن بەختەوەر و ئاسوودە ژیاون و چەند لەخودای گەورە ترساون بۆت دەرئەکەوێ ئێمە لەچ ژیانێکی تاڵداین.




دەگێرنەوە ئافرەتێك شـــكایەتی برد بۆ ئەنجومەنی قازی (موســـای کوڕی ئیســـحاق) لەشـاری (الری)، وەکیلی ئافرەتەکە ڕایگەیاند کە پێنج سـەد دینار (مارەیی) ئافرەتەکە لەسەر مێردەکەیەتی، بەڵام پیاوەکەی نکوڵی لێدەکات..! قازی بەوەکیلی ئافرەتەکەی گوت: شـــایەتـت کـوا ..؟ هەنـدێـک لەشـــایەتحاڵەکـان داوای ئەوەیـان کـرد . کەئافرەتەکە ببینن ، تاکو لەکاتی شـــایەدیەکە ئاماژەی بۆ بکەن، شـــاهێد حاڵەکە هەســـتـاو بەئـافرەتەکەی گوت: هەســـتە ســـەرپێ، هـاوســـەری ئـافرەتەکە گوتی: ئەوەچیدەکەن ؟! وەکیلەکە گوتی: سـەیری دەم وچاوی ئافرەتەکەت دەکەن، بۆئەوەی لەکاتی دانیشـتنەکە بیناسـنەوە (ئەمەش بۆپێویسـتیە). هاوسـەرەکەی گوتی: من قازی دەکەم بەشاهێد، کە ئەو مارەییەی ئەو لەسەرمەو دەیدەم،بەس وازی لێبێنن وسەیری ڕوخساری مەکەن، ئافرەتەکەش گوتی: منیش قازی دەکەم باشاهێد، کەئەو مارەییەی پێ دەبەخشم، وگەردەنی لەدونیاو قیامەت ئازا دەکەم، قازی گوتی: بەڕاستی سەرسامی غیرەتی هەردووکتان بووم. ئەم باسە لەڕێزدارترینی ڕەوشتەکان ئەنوسرێتەوە.[1]

پیاوەکە تەنها لەبەر ئەوەی ســـەیری دەم و چاوی ژنەکەی نەکەن گوتی: من ئەوەی لەســـەرمە مارەییەکەی دەدەم، بەڵام بەداخەوە پیاوانی ئێســـتاکە خۆیان داوا لە خێزانەکانیان دەکەن کام جلی سـەرنج ڕاکێشـە بیکڕن و بیکەنە بەر لە بەرچاوی خەڵك پەنـا بەخوا!، کەچی لەڕابردوودا ئـافرەتـەکـەش بـەرامبـەر ئـەو هـەڵوێســـتـە جوانـەی پیاوەکەی بەخشی و گەردەنی ئازاکرد لە دونیا و قیامەت، بەڕاستی نمونەی هاوسەرانی ئیمانداری پێشـــین گەلێك زۆرن بۆ ئەوەی چاویان لێبکەین تا ئێمەش ئاســـوودە بژین چونکە جوانترین وانەو پەندی تێدایە بۆئەوەی ئێمەش بەختەوەر بین.

بۆیە ڕەحمەتان لێبێت هیچ کات نەکەن هانا ببەنە بەر تەڵاق هەرکامەتان شـتێك لە ئیســلامە دەزانن فێری یەکتری بکەن بۆئەوەی خۆشـبەخت و ئاســوودە بژین لە ژیانی دونیا و دووربن لە غەم و ناخۆشی و کێشەو ئاژاوە و تەڵاق و جیابوونەوە.

---

[1]- ( مكارم تاريخ بغداد | ١٥ / ٥٣ ).





# دوارۆژی منداڵێکی سەرکەوتوو!

ئەم سەردەمەی ئێستامان پڕیەتی لە کێشەو ئاژاوە و ناخۆشی، کومەڵگا ناخی دەکوڵێ و دەناڵێنێ بەدەست زۆربوونی کێشەکان کێشەی کوشتن، دزی، تەڵاق، دەستدرێژی بۆسەر ناموسی خەڵك، زووڵم و ستەم و ناپاکی دووڕووی ... هتد کێشە و ئاژاوەکان بوونە بە پەڵە هەورێکی ڕەش سەراپای دونیایان داپۆشیوە.

هیچ ڕۆژێك نیە هەواڵی کێشەو خراپەو تاوانێك نەبیستین، فلان لەسەر دزیکردن زیندانی کرا، فلان گەنج لەکاتی خواردنی مادەی هۆشبەر بەسەر خۆشی دایك و باوکی کوشت، فلانە ئافرەت لەسەر ناموس کوژرا، فلان ئەم ستەمەی کرد لە خێزانی پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ ئافرەتی تر هەبووە، ئەمانە و سەدان کێشەی تر ڕۆژانە دەبیستین کە مرۆڤ عەقڵ و هۆشی دەوەستێ تەنها غەم و خەفەتی پێدەخوات.

بۆیە سەرەتا بۆ نەمانی کێشەو ئاژاوەکانی کۆمەڵگا و ڕێگری کردن لە بڵاوبونەوەی، زۆر پێویستە لە پەروەردەی منداڵ دەست پێبکەین بە پەروەردەکردنێکی ئیمانی کە باوك و دایك هەر لە منداڵیەوە بەرامبەر منداڵەکانیان بیگرنە بەر تاوەکو جیلی نمونەیی بن بۆ کۆمەڵگە و ئارامی و ئاسوودەی بگەڕێتەوە موسوڵمانان.

بۆیە ڕوودەکەینە باوك و دایکان پێیان دەڵێن لەخودای گەورە بترسێن و ئەو منداڵانەتان کە هێناوتانە ژیان لە دوارۆژ لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکرێت لەسەریان کە بۆچی کەمتەر خەم بوون لە پەروەردەکردنیان، کە بەداخەوە زۆرێك لە باوك و دایکان بەشێوەیەك لە شێوەکان بێ هەڵوێستن لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان، تەنها خەریکی زۆر کردنی منداڵن بەبێ ئەوەی گرنگی بە پەروەردەکردنیان بدەن، بۆیە دوارۆژێکی تاریك دەبێتە سەرەنجامی منداڵەکانیان بەبێ پەروەردەی گەورە دەبن دواتر دەبن بە نەهامەتی و ناخۆشی بۆ دایك و باوك و بۆ کۆمەڵگەش.





بۆیە خوای گەورە ئاگاداری کردوینەتەوە لە تاقیکردنەوەی ماڵ و منداڵ کە فیتنەو ناخۆشیە ئەگەر هاتوو باوك و دایك ڕۆڵ نەگێڕن لە نەسیحەت و ئامۆژگاری کردنیان تاوەکو لە داهاتوو کەسی ژیرو ئاقڵ بن.

﴿إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ﴾[1]. واتە: دڵنیابن کە ماڵ و سامان و ڕۆڵە و نەوەکانتان بۆ تاقی کردنەوەتانن.

بۆیە دەبێ گرنگی زۆر بە پەروەردەی منداڵەکانمان بدەین هەتاوەکو لە دوارۆژ کەسی ساڵح و لەخواترسیان لێ دەربچن، هەر منداڵێك ئیمان و تەقوا لە دڵی چەسپا لە دوارۆژ پەنا بۆکاری خراپ نابات و باوك و دایکی شەرمەزار ناکات، هەمیشە هەست بەچاودێری خوای گەورە دەکات خەڵکی لێی ئەمین دەبن.

باوك و دایکی واهەن کەمنداڵیان تازە لەدایك بووە گۆرانی لەبن گوێ دەڵێن، فێری زمان هێنانە دەری دەکەن، کە بەقسەش هات فێری جوێندانی دەکەن دەیان قسەو جوڵەی نەشیاویان فێردەکەن، یان دایکی وا هەیە بۆ کچە منداڵەکەی میکیاج و سوراوی بۆ دەکڕێ هەر لە منالیەوە فێری جلی نیمچە ڕووتی دەکات، بۆیە منداڵەکە کاتێك گەورە بوو لەسەر هەڵسوکەوتی نەشیاو پەروەردە دەبێ سەرەنجام کەسێکی خراپ و دۆڕاوی لێ دەردەچێ.

کەوایە زۆر پێویستە لە سەر باوك و دایك پەروەردەیەکی ئیمانی جوان فێری منداڵەکانیان بکەن، چونکە تاکە پەروەردەیەك هەبێت کە کاریگەری لەسەر منداڵەکان هەبێ تەنها پەروەردەی ئیسلامە، کە هەموو ڕەوشتی جوان و، ڕەحم و، سۆزو، میهرەبانیە، هەر باوك و دایکێك لە منداڵیەوە پەروەردەی منداڵەکانیان بکەن بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە باشترین منداڵی لێ دەردەچێ لەگشت ڕووێکەوە دەبنە پێشەنگ لەجوامێری و ئەخلاق بەرزی پیاوانی لە خوداترس.

---

[1] - سورەتی التغابن ئایەتی (١٥).

با بەیەکەوەش بچینە خزمەت نمونەیەك لە پێشـــنی چاکەکانمان تاکو باوك و دایکانی ئیمـانـدار چاوی لێبکەن کە چۆن جیاواز لـە بەناوبانگترین کەســـایەتییەکانی ئەم سەردەمەی ئێستامان گرنگیان داوە بە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان هەر لەسەرەتای لە دایك بوونیان و چاودێری کردنیان تاکو گەورە بوونیان و بوون بەگەنج.

ئەمەش خەلیفەی موسـوڵمانان و پێشـەنگی ئیمانداران (عومەری کوری عبدالعزیز) (رەحمەتی خوای گەورەی لێبێت) کە حوکم و دەسـەڵاتی ئوممەتی ئیسـلامی لە ژێر دەست بوو، خۆشترین ژیانی بۆ خەڵکی دەستە بەرکردبوو بەحوکمی ئیسلام، بەڵام ئەم بەرپرسیارییەتەی ئومەتی ئیسلام کە لە ئەستۆی بوو بێ ئاگای نەکرد لە پەروەردەکردنی منداڵەکانی، وەك باوك و دایکانی ئەم سـەردەمە بەهۆی کەمێك سـەرقال بوونیا بەدەوام یان هەر کارێك دەڵێن کاتمان نیە ئامۆژگاری منداڵەکانمان بکەین، بۆیە ئیمامی (عومەر) سـەرەرای کاروباری موسـوڵمانان منداڵەکانی پەروەردە کردووە بە جوانترین شێوە تاوەکو لە دوارۆژ کەسی نمونەیی بن، هەر لە منالیەوە مامۆستای بۆ گرتبوون تاوەکو فێری زانستی شـەرعیان بکات، زۆر سـور بوو لەسـەر پەروەردەکردنی منداڵەکانی بەقورئان و سوننەت.

لە (مەروانی کوری عبدالعزیزەوە) دەگێرنەوە کە (عمری کوری عبدالعیزیز) کوری نارد بۆ مەدینە تا لەوێ ئەدەب ورەوشـتی بەرز فێرببێت، بۆئەو مەبەسـتە دایە دەسـتی زانا (سـاڵحی کوری کیسـان) تا ئاگای لێ بێت و فێری بکات، بەردەوام نوێژەکانی بەکۆمەڵ پێ دەکرد بەڵام جارێکیان لەنوێژدا دواکەوت، (ساڵح) لێی پرسی: بۆچی دواکەوتی؟

گوتی: قژداهێنەرەکەم قژی دادەهێنام، ساڵح گوتی: یانی وات لێ هاتوە قژ داهێنانەکەت خۆشـەویسـتر بووە لە نوێژەکەت؟! بۆیە ئەم هەواڵەی ناردەوە بۆباوکی و باوکیشـی پیاوێکی نارد بۆ مەدینە و رای سپارد کەقسەی لەگەڵ نەکات تاسەری سفر دەکات .[1]

---

[1] - رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق(٤٥/١٣٦).




سبحان الله ئەمەیە هەڵوێستی باوکی ژیرو جوامێر لەسەر ئەوەی نوێژی دواکەوتووە بۆیە فەرمان دەکات قژی سفر بکرێت، بەڵام بەداخەوە بەشێك لە باوکانی ئێستا تاکە شتێك هەبێ خەمی لێ نەخۆن نوێژە، خەڵك بەدەست کوڕی گیریان خواردووە، ئاژاوە دەنێتەوە شەر دەفرۆشێ بە منداڵی جیران، باوکی هیچ هەڵوێستی نیە، بەباوکی دەڵێن: کوڕەکەت نایەتە مزگەوت لەگەڵ فلان کەسی ئاژاوەچی تا نیوەی شەوان دەگەڕێ لە کۆڵان بەبێ ئیشی دەسوڕێتەوە، دەڵێت: جاریٚ گەنجە دڵی ناشکێنم.
بەداخەوە ئینجا باوك و دایك پرسیاری هەموو شتێك لە کوڕی دەکەن تەنها نوێژ و ئیمان نەبێ، کورم جلت هەیە، کوڕم موبایلەکەت زۆر جوانە، کوڕم چەن هاوڕێت هەیە لە فەیسبوك، کوڕم تکایە زوو بڕۆ ئیش و کار درەنگ مەڕۆ، کوڕم ئەمڕۆ ڕۆژێکی چۆنت بەڕێکرد لەگەڵ هاوڕێکانت؟، بەڵام هیچ کات ناپرسێ کوڕم بۆ قورئان ناخوێنی، یاخود بڵێت کوڕم توخودا زوو بڕۆ بۆ مزگەوت و نوێژەکانت مەفەوتێنە، یان کوڕم خۆت شارەزای ئیسلام بکە و لە خودا بترسە قیامەت و ئاگری دۆزەخ زۆر سەختە بەرگەی ناگرین ئەی کوری شرینم توخودا ژیر و ئاقلبە و با بەهەشت شوێنمان بێ.
بۆیە پێشەوا (عومەری کوری عبدالعزیز) (ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێت) منداڵەکانی ئاوا پەروەردە ئەکرد، دەیزانی پەروەردەی باش و خراپ کاریگەری زۆری دەبێ لەسەر ئەخلاق و ڕەوشتی منداڵ، چونکە منداڵ لە بچوکییەوە لە سەرچی پەروەردە بکەی ئەو ڕەوشت و ئاکارە دەبێتە ئاقیبەتی، یان منداڵێکی ئاقڵ و ژیر و تێگەیشتوو دەبێت یان منداڵێکی خراپ و بێ ئەقڵ و تێنەگەیشتوو دەبێ.
بۆیە پەروەردەی ئیمانی لە داهاتووی منداڵەکان سوودی دەبێ و دەبنە پیاوی مەیدان لە جوامێری و ئەخلاق بەرزی و دونیا نەویستی و خودا ویستی، بۆیە کوڕەکەی پێشەوا (عومەر) کەناوی (عبدالمیك) بوو (ڕەحمەتی خوای گەورەیان لێبێت)، منداڵێکی نمونەی لێدەرچوو کاتێك بووە گەنج زۆر لە خودای گەورە دەترسا هەمیشە هەستی بە چاودێری دەکرد.




(عاصـــمی کوڕی أبو بکری کوڕی عبدالعزیز)، کە برازای (عومەر) بوو، دەڵێ: وەفدێك ڕۆیشـــتن بۆ خزمەت (ســـلیمانی کوڕی عبدالملك) و (عومەری کوڕی عبدوالعزیز)یش لەگەڵ دابوو (ڕەحمەتی خوای گەورەیان لێبێت)، من شـــەو لە لای (عبدوالملکی کوڕی عومەر) مامەوە، کە لەو کاتەدا ژنی نەهێنابوو مامەوە، نوێژی عیشـــامان کرد پێکەوە، پاشـان هەریکەو بەرەو پێخەفی خۆمان ڕۆیشـتین، (عبدالملك) یش هەسـتاوە چراکەی کوژاندەوە، دەســتی کرد بە نوێژکردن تا خەوم لێ کەوت، کاتێ بەخەبەر هاتم دەبینم ئەو ئایەتەی قورئان دەخوێنێتەوە: ﴿أَفَرَأَيْتَ إِن مَّتَّعْنَاهُمْ سِـنِينَ. ثُمَّ جَاءَهُم مَّا كَانُوا يُوعَدُونَ. مَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يُمَتَّعُونَ﴾[1]. واتـە: ئەی محمـد (ﷺ) دەبینی چەنـدان ســـاڵی تریش مۆڵەتی ژیانیان پێ دەدەین و پاشـــان مردنیان بەســـەردا بهێنن، چ کەڵکی هەیە بۆیان ئەو هەموو ساڵەی ژیانیان؟

بەردەوام دەگریا و پاشـــان ئایەتەکەی دووبارە دەکردەوە، هەرکە لێ دەبۆوە، تاوام لێ هـات گوتم: ئاوا بڕوا گریان لە ناوی دەبات، بۆیە بەدەنگی بەرز گوتم: (لا إلـه إلا الله و الحمدلله) وەک ئەوەی بە خەبەربم، تـا گریانەکەی پێ ببڕم، هەر هەســتی کرد من بە خەبەرم بێ دەنگ بوو ئیتر نوزەی لە خۆی بڕی ( ڕەحمەتی خوای لێبێت)[2].

ئا ئەمەیە گەورەی پەروەردەی ئیسلام لەسەر منداڵەکانمان کە چۆن شـیرینی ئیمان و ترســی خودای گەورە دەخاتە دڵەکانیانەوە، بیر لە ناخۆشـــییەکانی دواڕۆژ و مردن و قیامەت و ئاگری دۆزەخ دەکەنەوە، بەڵام گەنجەکانی ئەم ســـەردەمە بۆیە ئاژاوە چی و شـــەڕاویان لێدەردەچێ چونکە تاوەکو نیوەی شـــەوان ناخەون و بەردەوام خەریکی ڕابواردن و کات بەفیڕۆ دانن بەشتی بێ سـوود و یاری دۆمینەو بلیاردو پۆپجی و قومارن و، هەر یەکەیان بەقاقـای پێکەنینەوە باسـی ڕاوکردنی نێچرەکانی خۆیان دەکەن بۆیەکتر کەچۆن ئافرەتەکانیان هەڵخەڵەتاندووە پێیان ڕابواردووە.

---

[1] - ( سورەتی الشعراء ئایەتی ٢٠٥ تاکو ٢٠٧)

[2] - مەجموعة رسائل الحافظ ابن رجب الحنبلی(٢/٤٧٩).





بۆیە بوونەتە فیتنە و ئاژاوە بۆ کۆمەڵگای موســوڵمانان، چونکە باوکان و دایکان منداڵەکانیان پەروەردەیەکی (عومەری) نەکردووە، بۆیە گەر هاتوو باوك و دایك پەروەردەیەکی ئیمانی منداڵەکانیان دا لە قوتابخانەی ئیسلام، لە دوارۆژدا ئەم منداڵە باوك و دایکی دەخاتە ســەر چاوی و جوانترین ڕێزیان لێدەگرێت، هیچ کات لەگەڵیان خراپ نابێ و هەوڵدەدات لە ئازار و ناخۆشیەکانیان کەم بکاتەوە، کاتێکیش پیربوون بە باشترین و جوانترین شێوە خزمەتیان دەکەن و لە خزمەتیان دەبن.

هەروەك چۆن (عبدالمیك) ( ڕەحمەتی خوای لێبێت) هەوڵدەدات ئازاری باوکی لەبیر بباتەوە، کاتێك براکەی وەفات دەکات و دەمرێت، کوڕێکی (عومەری کوڕی عبدالعزیز) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) مرد، (عومەر) هاتوو لای ســەری دانیشــیـــت و ســەری هەڵدایەوەو سەیرێکی کردوو، فرمێسك بە خوڕ لە چاوی هاتە خوارەوە، (عبدالملك)ی کوڕی هات بۆ لای و پێی گوت: ئەی ئەمیر چیە ئەڵێی ئەو مردنە لە کارەکانتی کردووی؟ بەڵکو ئەوە خەریکی کارێکی ترە دوور لەو کارەی تۆ، وابزانە تۆش مردوویت، و خۆڵیان کردووە بەسەر چاوتدا.

(عومەر) بە بیستنی ئەو قسەیە دەستی کرد بەگریان، پاشان گوتی: ڕەحمەتی خوات لێبێ کوڕی خۆم، والله تۆ بەرەکەتێکی زۆر گەورەی بەسەر باوکتەوە ئامۆژگاریەکانت سوودێکی زۆر مەزنی هەیە بۆ ئەوانەی ئامۆژگاریان دەکەیت، والله زۆر دڵتەنگ بووم بۆ بــراکەت، بەڵام هەر کە زانیم فریشتەی گیان کێشان هاتە ماڵەوەو هاتنەکەی ترساندمی وەک بڵێی بینیم بەچاوی خۆم، پاشان گوتی: بڕۆن کفــن و دفــنی بکەن.[1]

ئەمە نمونەی باوك و کوڕی لە خوداترس و خودا ویستن پێویستە ژیانیان لەگەورەترین کتێب بە زێر بنەخشــێنرێ هەتا دونیایە شــانازیان پێوە بکرێت، چونکە هەتا دونیایە کەسی وەك ئەمان بوونیان نابێتەوە لەسەر زەوی.

---

[1] - مەجموعة رسائل الحافظ ابن رجب الحنبلي(٢/٤٨٧).





بۆیە زۆر پێویستە لە سەر موسوڵمانان پێش ئەوەی ببن بە باوك و دایك ژیانی هاوسەری پێکبێنن پێش هەموو شتێك زۆر گرنگە بیر لەوە بکەنەوە چۆن منداڵەکانیان بکەنە نموونە و پێشەنگ لە کۆمەڵگا، زۆرێك لە کوڕان و کچان پێش ژیانی هاوسەر گێری بیر لەسەدان بیرۆکەو خەیاڵ دەکەنەوە چۆن ماڵێکی جوانیان هەبێت و چەندین قات بێ و غەمیان هەبوونی سەیارەیە تاکو لەگەڵ پیاوی گەشت و سەیران و گەڕان ئەنجام بدات، یان خەمی خراپ بوونی ماڵی خەزوور و خەسووەکانیەتی لەگەڵی، بۆیە دەیان غەمیان هەیە و غەمی پێوە دەخۆن بیر لەوەش ناکەنەوە خودای گەورە منداڵیان پێ ببەخشێ چۆن پەروەردەی بکەن، کاتێك چوونە ژیانی هاوسەریەتی تەنها منداڵ زۆر کردن بێت.
موسوڵمانی ژیر و تێگەیشتوو غەمی ئەوەی دەبێت چۆن بۆخودای گەورە بژیت لەگەڵ خێزان و منداڵەکانیەوە چۆن بتوانن مناڵەکەیان بکەنە نمونە بۆ داهاتوو، تاوەکو لە دونیا و قیامەت سود و خێری هەبێت بۆیان، نەوەك هەر منداڵ زۆرکردن بێت، ببنە شەقاوەی کۆڵان و خەڵك بەدەستیان گیر بخوات بەهۆی ئاژاوەو خراپەکانیانەوە، ئەوکاتی ژیانێکی خۆش بەڕێدەکەن ئەگەر ئاقڵ و ژیر و ئیسلام پەروەربوون ڕووبەرووی هەموو کۆسپ و ناخۆشیەکانی ژیان دەبنەوە ژیرانە مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکان دەکەن.
بۆیە ئەی باوکان و دایکانی بەڕێزم با خۆمان بۆ خودای گەورە یەکلای بکەینەوە هەموو هەوڵێك بدەین تاوەکو منداڵەکانمان پەروەردەیەکی قورئانی بکەین بە چاولێکردن لە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ و پێشینەچاکەکانی ئوممەتی ئیسلام تاوەکو لە دونیا و قیامەت خوای گەورە پاداشتمان بداتەوە لەسەر ئەو ماندوو بوونەی ئەنجامان داوە بۆ پەروەدەکردنیان بە بەهەشتی فیردەوس، بەئیزنی الله تعالی.




# غەم و ئازارەکانی دونیا

ئەم ژیانەی دونیا هەمووی بۆ مرۆڤایەتی تاقیکردنەوەی سەختە و پڕ بیەتی لە ئازار و غەم و خەفەت دەبێ مرۆڤ ئیمانێکی پتەوی بەخودای گەورە هەبێت تاکو بەسەر ناخۆشیی و ئازارەکانی دونیا سەرکەوتوو بێت و بە ئاسوودەیی ژیان بەڕێ بکات.

﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي كَبَدٍ﴾[1]. واتە: بەڕاستی ئێمە ئینسانمان دروست کردووە و بەردەوام لە نارەحەتی و سەغڵەتی و کێشە و ناخۆشیدا.

بۆیە ژیانی موسوڵمان هەموو تاقیکردنەوەیە بە خۆشی نارەحەتی و غەم و ئازار، تاکو بەندە ڕاستگۆکانی خودای گەورە بەدیاربکەون کە کامەیان بەڕاستی سوپاسگوزارو ئارامگرە لەسەر ناخۆشی و نارەحەتیەکانی دونیا.

﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ﴾[2]. واتە: ئایا خەڵکی وایان زانیوە، وازیان لێ دەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوە و تووشی خەم و سزا و ئازار نەکرێن؟

نەخێر بەهیچ شێوەیەك کەس پشت گوێ ناخرێت لەوەی ئیماندارو موسوڵمان بێت بە خۆشی و غەم و خەفەت و ئازار تاقی نەکرێتەوە، ئەمە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) خۆشەویستی خودا بوو، بەبێ ئەوەی باوکی بی بینێت لە سکی دایکی بوو ئەوکات باوکی دەمرێت بەبێ ئەوەی سۆزی باوکایەتی ببینێت، پاشان دایکی وەفات دەکات لەتەمەنی شەش ساڵی، دەکەوێتە دەست باپیری بەخێوی دەکات تاکو هەشت ساڵان دوای باپیریشی کۆچی دوایی دەکات، پاشان مامی دەیگرێتە ئەستۆ گەورەی دەکات ژنی بۆ دێنێت، پشتگیری دەکات لە دەست درێژی کافرەکان ناهێڵێت ئازاری بدەن.

[1] - سورەتی البلد ئایەتی (٤).
[2] - سورەتی العنكبوت ئایەتی (٢).





بەڵام لە یەك ساڵدا خێزانی (خەدیجە) (ڕەزای خوای لێبێت) لەگەل مامی (ئەبو تالیب) کۆچی دوایی دەکەن، بۆیە ئەو ساڵە بە ساڵی ماتەمینی (عام الحزن)ناسرا پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ زۆر غەم باربوو چونکە مامی پشتیوانی و بەرگری کەری بوو دژی کافرەکانی قورەیش، ئینجا خێزانی (خەدیجە) (ڕەزای خوای لێبێت) زۆر بەسۆز و دڵنەوایکەری پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ بوو، بەڵام لەیەك ساڵدا خودای گەورە هەردووکیانی لێ ساندەوە، بەم شێوەیە بەئازار و غەم ژیانی بەڕێکردووە بەقوربانی بین بەباوك و دایکەوە، بۆیە مرۆڤەکان هەمووکات لەتاقیکردنەوەی خودای گەورەدان.
﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ﴾[1]. واتە: سوێند بەخودا بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا خوای گەورە ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیان ناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.
غەم و خەفەت و ناخۆشی یەکێکە لە تاقیکردنەوەکانی خوای گەورە بۆ بەندەکانی، ئەگەر سەیر بکەین لە ژیانی ڕۆژانەماندا دەبینین هیچ کەس و مرۆڤێك نیە غەم و خەفەتی لە دڵدانەبێت! کەسی وا هەیە غەمی قوتابخانەیە تا پلەی بەرز بەدەستبێنێ، یا خەمی وەرگیرانی لە زانکۆ و پەیمانگا، یان غەمی چوونە ناو پرۆسەی هاوسەرگیرییە، یان غەمی ماڵ و منداڵیەتی کە چۆن خەرجیان بۆ دابین بکات و بەخێویان بکات، یان بێ منالە و منالیان نابێت و هەمیشە غەمبارە، یان تووشی نەخۆشی درێژخایەن بووە هتد... ئەمانە و سەدان غەمی تر کە مرۆڤەکان گیرۆدەی بوونە و بەدەستیەوە ئەناڵێنن لەبەر بێ چارەیی هەوڵی خۆکوشتن و لەناوبردن ئەدەن، ئەی موسوڵمان ڕەحمەتی خودا برژێ بەسەر دڵ و دەروونتان ئەوە بزانە هیچ کەس نیە لەم دونیاییە کێشە و غەمێکی نەبێ.

[1] - سورەتی العنکبوت ئایەتی (٣).




لە دەوامەکەم برایەکی بەڕێزی هاوپۆلم پێکەوە وەستا بووین لە بەرامبەر ساحەکە زۆر غەمبار و بێتاقەت دیار بوو، منیش لێیم پرسی: برا گیان ئەوە چیە بۆ ئاوا بێتاقەت و غەمبار دیاری پێدەچێ غەم و کێشەت هەبێت، گوتی: برام بۆ هیچ کەس هەیە لە دونیا غەم و خەفەتی نەبێت! گوتم: بەخودا ڕاست دەڵێیت، ئیتر بێدەنگ بوو حەزی نەکرد باسی غەم و کێشەی بکات.

مرۆڤەکان کەس ئاگایان لە حاڵی یەکتری نیە نازانێ ئێستا کەسی واهەیە لە ناو جێگایە لەگەڵ مردن ململانێ دەکات، یان تووشی گرتن و زیندان بووە بە بوهتان چەندین ساڵە بەغەمی ڕزگاربوونیەوە دەناڵێنێ، یان تووشی کێشەو ڕووداوی هاتوچۆو سەیارە بووە، یان لەگەڵ پیاوی هەموو کات کێشەو گرفتی هەیە کەخراپە لەگەڵی، یان لە دادگادان بۆ جیابوونەوە و تەلاق یان بۆ سوڵحی کوشتن، یان بۆ سەدان کێشەی تر، یان کەسی واهەیە لە خۆشی و گەشت و گوزارە، یان بۆ خۆشی و ڕابواردن چۆتە وڵاتان بگەڕێ، یان خەریکی مارە برِین و بە شوودانە، یان خەریکی گواستنەوەی بووکە هتد... ئەمانە و چەندان خۆشی و ڕابواردنی تر جا کەس ئاگای لە خۆشی ڕابواردن و غەم و خەفەتی کەس نیە، چونکە بەراستی گەر تۆ یەك غەمت هەبێ کەسی تر هەیە چەندان غەمی لە تۆ زیاتری هەیە، یان چاوێکت ناتەواوە جوان شت نابینێ، ئەوە کەسی تر هەیە چاوی کوێرە و نابینایە، یان پەنجەیەکت نوقسانە ئەوە کەسی تر هەیە دەستی نییە، یا تۆ قاچێکت شەلەلە، ئەوە کەسی تر هەیە هەردوو قاچی نیە لەسەر کورسی کەوتووە، یان تۆ دایکت نیە کەسی تر هەیە بێ کەس گەورە بووەو یەتیمە هەموو ئاواتی بوونی دایکێك و باوکێکە..! بۆیە ئەی بەندەی خودا ئەوە بزانە زۆرکەس بارودۆخی لەهی تۆ زۆر خراپترە بۆیە ئارام بگرە و لەتاقیکردنەوەی خوای گەورە براوەبە.﴿ سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾[1]. واتە: دڵنیاش بن کە خودا دوای تەنگانە هەرزانی دەهێنێت، دوای ناخۆشی خۆشی دەهێنێت.

---

[1] - سورەتی الطلاق ئایەتی (٧).





کەوابوو ئەوەی گرنگە بۆ موسوڵمان گەر لە خۆشی و لەش ساغی یان لە غەم و خەفەت و ناخۆشی و بەڵا بوو هەمیشە خوای گەورەی لە بیر بێ لە هەمووکات وساتێکدا ئارام بگرێت سووپاسی خودا بکات و شوکر بێ لەسەر تاقیکردنەوەکان.

بۆیە دڵنیابە هەر ناخۆشییەکت کەبەسەردێ لەژیانی دونیا لە غەم و ناخۆشی و ئازار و ناڕەحەتی بەئارام گرتنت لەسەری دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان.

(مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلَ اوَصَبٍ وَلَا هَمٍّ وَلَا حُزْنٍ وَلَاأَذًى وَلَا غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةَ يُشَاكُهَا إِلَّا كَفَّرَاللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ)[1]. واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: هەرشتێك توشی موسوڵمان ببێت لەغەم وخەفەت وئازارو ناخۆشی و دڵتەنگیَ و ناڕەحەتی ئیللا خودا لەتاوانەکانی دەسڕێتەوە بە ئارام گرتن لە سەری ئەگەر دڕکێکیش بێت تاوانت کەم دەکاتەوە بە ئارام گرتن.

بەڕاستی ئەو کەسانەی ڕۆچونە لە ئیمان و تەقوا سنورەکانی خوای گەورە نابەزێنن پەروەردەی باشترین وانە بوونە لە قوتابخانەی ئیسلام، بەرگەی غەم و ناسۆرو میحنەتەکانی ئەم ژیانەی دونیا ئەگرن، هەر شتێکیان بەسەر بێت لە خۆشی و ناخۆشی و غەم و دڵتەنگی و لەدەستدانی ئازیزان و خۆشەویستانی دەڵێن: ئێمە موڵکی خودای گەورەین هەر بۆ لای ئەویشە گەڕانەوەمان.

﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾[2]. واتە: ئەوانەی هەر کاتێك توشی بەڵاو ناخۆشیەك دەبن دەڵێن: ئێمە موڵکی خواین و هەرچی هەمانە بەخششی خوایە، سەر ئەنجامیش تەنها هەر بۆ لای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان.

بەڵام ئەوانەی دوورن لە بەرنامەی خوای گەورە و پشتێکەر و دژایەتی فەرمانی خودا دەکەن، بەراستی غەم و پەژارە میوانی دڵیانە، هەمیشە بێزار و دڵتەنگن لە ژیان.

---

[1] - ( رواە البخاری، کتاب المرضی، باب ما جاء فی کفارة المرض، ژمارەی فەرموودە: (٥٦٤١).

[2] - سورەتی البقرة ئایەتی (١٥٦).





﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾[1]. واتە: هەرکەسێك ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تێ بکات کە ئیسلامە، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت.

(ئیبن قەیم) (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرموێت: ئەگەر مرۆڤ شەو و ڕۆژ کە هەستایەوە تاکە غەمێك کە هەیبوو تەنها خودای گەورە بوو، خودای گەورە هەموو پێویستییەکانی بۆ هەڵدەگرێت، هەموو غەمەکانی بۆ هەڵدەگرێتو، دڵی بۆ خۆشەویستی خۆی، زمانی بۆ یادی خۆیو، ئەندامەکانی بۆ تاعەتی خۆی خاڵی دەکات.
بەڵام ئەگەر شەو و ڕۆژی بە غەمی دونیاوە کردەوە، خودای گەورە غەم و خەفەت و نارەحەتی دونیای دەخاتە کۆڵ و وێڵی دەکات بۆ نەفسی خۆی، خودا دڵی بە خۆشەویستی خەڵك سەرقاڵ دەکات و لە خۆشەویستی ئەو بێ خەبەر دەبێت، زمانی بە یادی ئەوانەوە سەرقاڵ دەکات و لە یادی خوداوە بێ خەبەر دەبێت، وە ئەندامەکانی بە خزمەت و کاروباری ئەوانەوە سەرقاڵ دەکات و لە تاعەتی خودا بێ خەبەر دەبێت. بۆیە وەکو ئاژەڵ لە خزمەتی خەڵکی دیکەدا دەگەڕێت و دەسووڕێت، وەکو کوورە کە فوو لە سکی خۆی دەکات و ئەندامەکانی دەهێنێتە پاڵ یەکتر بۆ ئەوەی کە سوود بە غەیری خۆی بگەیەنێت، بۆیە هەر کەسێك کە ڕووی لە بەندایەتی بۆ خودا و تاعەت و خۆشەویستی خودا هەڵگێڕێتەوە، بە بەندایەتی کردن بۆ خەڵك و خۆشەویستی و خزمەت کردنیان موبتەلا دەبێت. خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾[2]. واتە: کەسێك خۆی کوێر بکات لە ئاستی قورئان و یادی خوای میهرەبان، ئەوە ئێمە شەیتانێك دەکەینە ملۆزمی و هەمیشە دەبێتە یار و یاوەری و لەگەڵیدا دەبێت.[3]

---

[1] - سورەتی طه ئایەتی (١٢٤).
[2] - سورەتی الزخرف ئایەتی (٣٦).
[3] - (الفوائد، ص: (١٥٩).







لەم ڕۆژگارەی ئێستامان خەڵکی هەموو دووره پەرێزن لەدینی خودا غەمیان قیامەت و ڕازیبونی خوا نیە، بۆیە هەر کەسێك ئەبینی ئەڵێ خۆزگەم بە زەمانی ڕابردوو، ئەوکات خۆشتر بوو لە ئێستا، نەمان ئەزانی غەم و خەفەت چیە، ئەمڕۆ غەم ئێمەی کوشت، برا لەگەڵ برا پەیوەندی خۆش نیە قسەیان نیە لەگەڵ یەکتر، گەنجە بەخۆشەویستی ژن دێنێ بەیانی خراپە و غەدری لێدەکات و تەڵاقی دەدات، دایك و باوکە منداڵیان دەبێ و ئیهمالی دەکەن لە پەروەردەی ئیسلامی لە قوتابخانەی ئیمان و ئەخلاق و ڕەوشت، هەر بۆیە بەیانی مناڵەکە لە کۆڵان و بن دیوار لای هاوڕێ خراپەکانی پەروەردە بووە، دەبێتە بەیانی کوڕەکەیان ژن دێنێ دایك و باوکی پیر دەبن بەخێویان ناکات فڕێیان ئەداتە سەر جادە، ئەمەش هەمووی هۆکار و سەرەنجامی دوورکەوتنەوەی موسوڵمانانە لە بەرنامەی ئیسلام. بۆیە ئەگەر هاتووخۆمان تەسلیمی خوای گەورە کرد، سەراپا غەم و پەژارە و کێشەکانمان بۆلای خوا برد.

﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾[1]. واتە: لە وەڵامیاندا وتی: بەڕاستی من باسی سکاڵا و غەم و پەژارەم هەر بۆ لای خوا دەبەم.

بەڵێ گەر بەڕاستی خۆمان تەسلیمی خوای گەورە کرد پابەندی فەرمانەکانی بووین، ئەوکات غەم و خەفەتت لە دڵمان نامێنێت، غەممان دەبێتە ئەوەی زوو لە کاتی خۆی نوێژەکانمان بکەین، چۆن ببینە بەندەیەکی بۆ خوا سوڵحاو سنورەکانی خوا نەبەزێنین.

﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾[2]. واتە: ئەی ئیمانداران کۆڵ مەدەن و ساردمەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتووترن ئەگەر ئیمانداری چاك و ڕاست و دروست بن.

---

[1] - سورەتی یوسف ئایەتی (٨٦).

[2] - سورەتی ال عمران ئایەتی (١٣٩).




بۆیە ئەی بەندەكانی خودا ئەوە بزانن ئەم ژیانەی دونیا جێگای مانەوە و ئیسراحەت و ڕابواردن نیە، كە تۆ تووشی ناخۆشی و غەم خەفەت نەبی، چونكە گشت مرۆڤەكان لە ژیانی دونیا لە تاقیكردنەوەی خوای گەورەن تا دونیاخراپ بوون و گەڕانەوە بۆ لای خوا. كەوابو تەنها كەسانێك زۆر بێغەمن لە دونیادا كە بەڕاستی بەندەی خوای گەورەن، پشت و پەنایان تەنها بە خوای گەورە بەستووە، چونكە لە حەقیقەت و ڕاستی ژیانی دونیا تێگەیشتوونە كەتەنها ڕابواردنێكی زۆر كەمە، مانەوەی یەكجارەكی لەدونیاكەی ترە كە قیامەتی نەبڕاوەیە.

﴿إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ﴾[1]. واتە: بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ڕابواردنێكی كەمە وە بەڕاستی هەر پاشەڕۆژ جێی حەسانەوەی هەمیشەییە.

بۆیە هیچ گرنگ نیە لای ئەو بەخۆشی و ڕابواردنەكانی دونیا هەڵبخەڵێ، غەمی تەنها شتە كاتیەكانی دونیا بێت، بەڵكوو هەوڵی ئەوە دەدات بەهۆی كاروكردەوەی چاكە لەم دونیایە ژیان بباتە سەر تاكو بەهەشتێك بەدەست بێنێت كە غەم و خەفەتی تێدانیە.

﴿تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[2]. واتە: ئەوە ئەو بەهەشتەیە كە پێتان دراوە بەهۆی ئەو كارو كردەوانەیە كە لە دونیا ئەنجامتان دەدا.

بۆیە غەم ناخۆن لەژیانی دونیا لەوەی چیان بەسەر دێ، حاڵیان چۆنە چیان هەیە لەماڵ گەر خاوەنی هیچ نەبن لە ژیانی دونیا، لەنەبونی بن جیاواز وەك خەڵكی كە خۆشترین ژیانیان هەیە، خانووی چەندین قات شوقەو كارگە و كۆمپانیایان هەیە، جوانترین و بەرزترین مۆدێل سەیارەیان هەیە، هیچ غەمیان ئەمە نیە، خەفەت ناخۆن تەنها غەمیان عیبادەت و بەندایەتیە بۆ خودای گەورە چونكە دەزانن ئەو كارەی دەیكەن بۆ ڕەزامەندی خوایەو بەهەشتی لەگەڵە! هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:

---

[1] - سورەتی غافر ئایەتی (٣٩).

[2] سورەتی الاعراف ئایەتی (٤٣).





﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[1]. واتە: ئاگاداربن بێگومان دۆستانی خوا ترسیان لە سەرنییە خەفەتیش ناخۆن.
بەڵێ ئەوانەی بۆ خودا ژیان سەرەپای تەمەنیان ناخۆشی و غەم و میحنەت بوو، بەڵام سەبریان گرت بەهیوای ڕەحمی خوا بوون بەهەشتیان پێ ببەخشێ، بەهۆی ئەوەی لە دونیا تەنها بۆ خوای گەورە ژیان، موسوڵمانێك بوون هەردەم لەخزمەت خەڵکی بوون یارمەتیان ئەدان، غەمی هەژار وفەقیر غەمی خۆیان بوو موسوڵمانێکی دڵسۆز و بەئەمەکی ئیسلام بوون بەدڵ و بە گیان لەگەڵ خوای گەورەبوون واتە بەڕاست ودروستی بەندەی خوا بوون، بۆیە لەقیامەتدا دەڵێن: ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾[2]. واتە: ئینجا هەمووان لەخۆشیدا دەڵێن: سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کەهەرچی غەم وپەژارەی لە دڵ ودەروونی دەرکردین، بەڕاستی پەروەردگارمان زۆر لێخۆشبووسوپاسگوزارە.
لەوکاتەدا غەم وخەفەتی دونیایان هەموو لەبیر دەچێت کاتێك تا نیوەی شەو چاوەکانی سوور دەبوون و دەگریان لەبەر ئازار و کێشە و گرفتەکانیان، لەبەر ئەوەی بێوەژنیان کردبوون بەغەدر و زوڵم پیاوەکەیان بێ سەرو شوێن کردبوو، یاخود لەبەر ئەوەی پیاوەکەی غەدری لێکردبوو بەناحەق تەڵاقیدا بوو، بۆیە ئەوکاتێك دەچنە بەهەشت هەمووشتیان بیردەچێ و کات کاتی خۆشی و ڕابواردنە.
﴿الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِنْ فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ﴾[3]. واتە: ئەو خوایەی کە جێنشینی کردین لەماڵی هەمیشەیدا بە بەخشش ورێزی تایبەتی خۆی ئیتر هیچ نەخۆشی وناخۆشیەك توخنمان ناکەوێت، هیچ ئازارو ئێشێکی دەروونی توشمان نابێت وهیچ بێزاری وماندووبوونێکیش ڕوومان تێناکات .

[1] - سورەتی یونس ئایەتی (٦٢).
[2] - سورەتی فاطرئایەتی (٣٤).
[3]- سورەتی فاطرئایەتی (٣٥).




بۆیە با هەموو غەم و خەفەتەکانمان لە دونیا تەنها ئەوەبێت ڕەزامەندی خودای گەورە بەدەست بێنین تاکو لە دواڕۆژ خوای گەورە بمان خاتە بەهەشتی فیردەوس، کە نەغەم و خەفەتی لێیە نە ماندوو بوون، نەپیر بوون نەبرسی بوون نە هیلاکی و نەدابڕان لە ئازیزو خۆشەویستان، تەنها خۆشی و ئاسوودەیی لێیە، بۆیە با هەوڵی بۆ بدەین ئەی بەندەکانی خودا ئەگەر ژیر و ئاقڵین ئەو بەهەشتە پڕ لەنازو نیعمەتە ناگۆڕینەوە بەهەرچی سەروەت و سامانی دونیا هەیە ئەگەرچی گیان و نەفس و ماڵ و هەموو شتمان داوە لە پێناویدا.

بۆیە با ئارام بگرین لەسەر ئەو تاقیکردنەوانەی دونیا کەهەموو کاتین و بەیەك چوونە بەهەشت گشت ناخۆشیەکان لەبیر دەکەین.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﴿ﷺ﴾:( يُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْسًا فِي الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِي الْجَنَّةِ، فَيُقَالُ لَهُ: يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ بُؤْسًا قَطُّ؟ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ؟ فَيَقُولُ: لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ، مَا مَرَّ بِي بُؤْسٌ قَطُّ، وَلَا رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ)[1]. واتە: (أنس)ی کوڕی (مالك) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خودا ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی: خێر لە خۆنەدیوترین کەسیش لە دونیادا لەبەهەشتیەکان دەهێنرێت یەکجار دەیخەنە بەهەشت و دەری دەهێنن پاشان پێی دەوترێت: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هەرگیز ناخۆشیت بەخۆتەوە بینیوە، ئایا هەرگیز سەختیی بەسەرتا تێپەڕیوە، ئەویش دەڵێت: نەبەخودا ئەی پەروەردگار، هەرگیز ناخۆشیم لە ژیاندا نەدیوە، هەرگیز سەختیم نەدیوە.

کەوابوو ئارام بگرن ئەی ئەوانەی پێتان وایە هیچ خۆشییەکتان نەبینیوە لە دونیا ئارامبگرن خودا ویستبن بەندەیەکی ڕاستگۆی خودای گەورەبن خۆشی و ئاسوودەیتان تەنها لە بەهەشتی خودای بەسۆزو رەحم دەبینین بۆیەکجاری بە ئیزنی الله تعالى.

---

[1] - صحيح مسلم، ژمارەی فەرموودە: (٢٨٠٧).





# لەوانە مەبە کە لە قیامەت پەشیمانن..!

بەڕاستی ژیانی دونیا خۆشییەکانی لەژێر دەستی مرۆڤن، هەرچی شتێك لەژیان بوونی هەیە، پارە، دەسەڵات و سوڵتە، ژن، هەرچی خۆشی هەیە گشتی وایان کردووە مرۆڤ تەنها بۆ گەیشتن بەئارەزووەکانی تێبکۆشێ تەنانەت گیان و خوێنی دەکاتە قوربانی لەپێناویدا، تاکو خۆشی و ڕابواردنێکی کەم بەدەست بێنێ.

بۆیە لەدونیا فەرمانی خودا پشتگوێ دەخەن تەمەن و ژیانیان لەسەر پێچی خودای گەورە بەهەدەر ئەدەن، هەر بۆیە قیامەت و مردن بەدوور دەزانن، ئەمەش وادەکات دڵەکانیان ڕەق بێت و لەسەر تاوان کردن بەردەوامبن.

﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا﴾[1]. واتە: بەڕاستی ئەوان قیامەت بەدوور دەبینن، بەدووری دەزانن.

بۆیە ئامۆژگاری و پەند وەرناگرێ کاتێك موسوڵمانێك قسەی خێری بۆ دەکات، برای من خوشکی بەڕێزم تکایە وریابنەوە دەست هەڵگرن لەکاری خراپ و سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە، بەڵام گوێ یان بەئامۆژگاری نەئەدا گاڵتەیان پێ ئەهات، هەر بەدوای خۆشی و ڕابواردنی هەواو و هەوەسی کەوتبوو، غەم و ئارەزووی خانویی بەرزی چەندین قات بوو، گشت ساڵێك چاوەڕێی هاتنی مۆدێلی سەیارەی نوێی بوو، تاکو جۆری سەیارەی بگۆڕێت بەگرانبەهاترین، یاخود لەگەڵ خێزانی هەر هەفتەیەو لە پارك و گەشت و گوزار لەم شارو ئەو شار ئەسوڕایەوە بۆ جەوگۆڕین، خۆشترین شوقەو ئوتێلی گرانبەهایان ئەگرت تاکو خۆیی و منداڵەکانی ڕۆژانەی تێدابەسەر ببەن، بەتەواوی نوقمی خۆشییە کاتیەکانی دونیا ببوون و مردن و لێپرسینەوەی خوای گەورەیان لەبیر کردبوو، تاکە ئامانج و هەوڵ و ماندوبوونیان تەنها بۆ خۆشی و ڕابواردن بوو لە دونیا، بەبێ ئەوەی بیربکاتەوە بۆ تاقیکردنەوە هاتوونەتە دونیا و لەلایەن خودای گەورە دروستکراون بۆ ماوەیەکی کەم و کاتی.

---

[1] - سورەتی المعارج ئایەتی (٧).





﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾[1]. واتە: ئەو خوایەی خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندتر ئەنجام دەدات.

بەڵێ تاکو لەژیان بوو زۆر بێ ئاگاو نەزان بوو هیچ بیریکی لە دوارۆژی خۆی نەدەکردەوە، کە رۆژێکی لە پێشە هیچ شك و گومانی تێدانیە ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا بەتەنهایی.
﴿وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا﴾[2]. واتە: یەکە یەکەی ئەوخەڵکە بە تاك و تەنهایی دێت ئامادە دەکرێت لەبەردەم دادگای پڕ لە دادوەری خوادا.

بۆیە خۆشی و ڕابوادنی دونیا وای لێکردبوو بەرنامەی خودا کە ئیسلامە لەبیربکات، هیچ رۆژێك غەمی ئەوەی نەبوو هەوڵی فێربوونی دینی خوای گەورەی بدات، تاکو حەقیقەتی ژیانی کاتی دونیای بۆ ڕوون بێتەوە کەهیچ نیە تەنها ڕابواردنێکی کەم نەبێت.
﴿إِنَّمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ﴾[3]. واتە: بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ڕابواردن و خۆشیەکی زۆر کەمە.

چونکە بەڕاستی هیچ کەسێك لە ژیان تێ ناگات کە چۆن بژیت و تەمەنی لەچی بەسەر ببات گەربێت و ئیسلام بەرنامەی نەبێت و بەڕاست و دروستی خودای نەناسیبێ، وا هەست ئەکات تەنها بۆ ئەوە هاتۆتە دونیا تاکو ڕابوێرێ و پارەو پول زۆربکات و شانازی بەخۆی بکات بەسەرخەڵکیدا کە دەوڵەمەندی دونیایە.

بۆیە تەنها هەوڵ و تەقەلای لە ژیانیدا بۆ کۆکردنەوەی پارەیە، بەگرتنە بەری ڕێگای دزی و فێڵ و سوو ڕێگای حەرامیش بێ هەوڵی خۆی ئەدات، تاکو بەئامانجی بگات، یان وادەزانێ ژیانی دونیا تەنها ئەوەیە ببێتە کاربەدەست و بەرپرسی خەڵکی، بۆیە ئەگەر هاتوو بووە بەڕێوەبەر لە شوێنێك هەوڵی ئەوەئەدات ببێتە گەورەتر لە پلەی بەڕێوەبەر،

---

[1] - سورەتی الملك ئایەتی (٢).
[2] - سورەتی مریم ئایەتی (٩٥).
[3] - سورەتی غافرئایەتی (٣٩).




واستە دەکات خۆی زۆر هیلاك و ماندوو ئەکات تا پۆستی تر وەربگرێت ببێتە جێگری وەزیر، بەمەش ناوەستێ غەمی ئەوەیە تاکو دەبێتە وەزیر، پاشان دڵی مورتاح نابێ تا ناوبانگ پەیدابکات لە دەوڵەت تاکو ببێتە سەرۆك وڵات و دەست بەسەر گشت شتێکدا بگرێت، بەڕاستی ئەمە ئامانجی گشت کەسێکی دونیا پەرست و خوانەویستە لەژیاندا، تێکۆشان و ماندوبوونی بۆ بەدەست هێنانی شتە دونیایی و مادییەکانە، بۆ ناوبانگ، پلەو پۆست، ژنی جوان، سەیارەو خانوی مواسەفات و بەرز، هەرچی شتێك هەیە لە دونیا دەیەوێت بەدەستی بێنێت، بەڵام نازانێت هەرچی لەدونیایە گشتی کاتین زوو بەسەر دەچێت و نامێنێت.

﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾[1].

واتە: هەرچی شتێك كە پێتان بەخشراوە ئەوە نازونیعمەت و زینەت و جوانی ژیانی دونیایە کە کاتین زوو تەواو دەبێ، بەڵام دڵنیابن کە ئەو بەشەی لای خودایە چاکترو بەردەوام ترە، ئایا ئەوە عەقڵ و ژیریتان ناخەنە کار؟!

بەڵام کەسی ژیرو ئیسلام پەروەر ئەم خۆشیانەی دونیا وای لێناکات قیامەت و خوای گەورە لەبیر بکات، لە حەقیقەتی دونیا تێگەیشتوە کە خۆشیەکی زۆر کەمە، دونیا بۆ هیچ کەسێك نابێت و نەبووە، بیری کردۆتەوە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) گشتی دونیایان جێهشت و گەڕانەوە بۆ لای خودای بەرزو بڵند، هاوەڵان و پێشینانی ئوممەت و پیاوچاکان هەموو کۆچی دواییان کرد، پادشاو زاڵم و ستەمکارە دڵ ڕەشەکان کە میللەتیان هەمووی پشتیان بوون لەخراپەکاری و سەرپێچی خوای گەورە هاوکاری بوون گشتیان لەناوچوون، جیران و دراوسێ و هاوڕێ و کەس و کار و خزمەکانی هەر ڕۆژەو یەکێکیان لە بەر چاوی دونیایان بەجێ دەهێشت، بۆیە ئەمانە هەموو دەبوونە پەند و وانە بۆیی کە دڵی مەیلی دونیا نەکات و هەمیشە بۆ دوارۆژی نەبڕاوە بژیت.

---

[1] - سورەتی القصص ئایەتی (٦٠).







﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ﴾[1]. واتە: ئایا ئەوە بەسەر زەویدانەڕۆیشتوون، تا تەماشا بکەن و سەرنج بدەن، سەرئەنجامی ئەوانەی پێش ئەمان چۆن بوو، چیان بەسەرهات؟ ئەوانە لەمان زۆر بەهێزتر بوون و جێ دەست و شوێنەواریان زیاتر لە زەویدا ئاشکرابوو، جا ئەوە بوو خودا بەهۆی گوناهەکانیانەوە لە ناوی بردن، کەس نەیتوانی لە سزای خوا بیانپارێزێت و پەنایان بدات و ڕزگاریان بکات.

بەڵێ موسوڵمانی ڕاستگۆ لە قورئانەکەی خوای گەورە پاشان سوننەتی پێغەمبەری ئازیزمان ﴿ﷺ﴾ بۆی روون بۆتەوە زانیویەتی دونیا بۆهیچ کەس نابێت، وە بینیویەتی باپیر و داپیری مردن کەسە خۆشەویستەکانی گشتی لێی جیابوونەوە، هەر ڕۆژەو هەواڵی مردنی کەسێکی ناسیاری بۆدێنن، بۆیە زیاتر تێدەگا لە ژیانی دونیا کەهیچ نیە و خۆشیەکی کەمە، بۆیە هەوڵ دەدات ژیانێك بەڕێ بکات لە پێناو خوای گەورە بێت، گشت ماندوبوون و تێکۆشانی تەنها بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەبێت، بۆیە ئەم کەسە بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوە هات، لە خۆشی و ناخۆشی هەمووکات گوێڕایەڵی فەرمانی خوای پایەبەرز بوو، زۆر ناخۆشی و میحنەتی چێشت لەدونیا لەسەر پەیڕەوکردنی دینی خودا ئینجا پاداشتی ئەو بەندەیە لای خوای گەورە بەهەشت و ڕەزامەندی خۆیەتی.

﴿لِلَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمُ الْحُسْنَىٰ﴾[2]. واتە: ئەوانەی کە بەدەم بانگەوازی خوای پەروەردگاریانەوە چوون، هەموو خۆشی و شادی و کامەرانی و ئاسوودەییەکان بۆ ئامادەیە لە بەهەشت.

---

[1] - سورەتی غافر ئایەتی (٢١).

[2] - سورەتی الرعد ئایەتی (١٨).





بەڵام ئەوانەی خوای گەورەیان لەبیرکردبوو لەپێناو خۆشی دونیادا، کە حیسابیان بۆ مردن و دوارۆژ نەئەکرد واهەستیان ئەکرد هەر بۆدونیا و ڕابواردن هاتوونەتە سەر زەوی، دژایەتی دین و موسوڵمانە خواوویستەکانیان ئەکرد گشت سەروەت و سامانی بۆ دژایەتی بەرنامەی خودا بەکار ئەهێنا، خۆی خەریکی بازرگانی و کڕین و فرۆشتنی کۆمپانیا بوو ئاگای لە ئەخلاقی خێزانی نەبوو.

یان کچ بوو جوانیەکەی دەر ئەخست بۆ خەڵکی تاکو گەنجەکان لەسەر ڕێگای ئیسلام گومڕابکات بەرەو ڕێگای خراپەکاری و دوای فێڵی شەیتان و دوورکەوتنەوە لە ڕێبازی ئیسلام، بۆیە پاداشتی ئەم جۆرە کەسانە لای خوای گەورە سزایەکی سەخت و مانەوەیانە لەئاگری دۆزەخ پەنا بەخوای گەورە، ئینجا گەر هەرچی سەروەت و سامان لە دونیا هەیە بیبەخشێت تاوەکو لەئاگری جەهەننەم قوتاری بێت ئەوا ڕزگاریان نابێ.

﴿وَالَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لَافْتَدَوْا بِهِ أُولَٰئِكَ لَهُمْ سُوءُ الْحِسَابِ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾[1]. واتە: ئەوانەش کە بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەچوون، ئەگەر بەڕاستی خاوەنی هەر هەموو شتێك بن لە زەویداو ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت، ئەوە دەیانکردە قوربانی خۆیان، لە پێناو ڕزگاربوونی خۆیاندا دەیان بەخشی، ئا ئەو جۆرە کەسانە بە خراپترین شێوە حسابیان لەگەڵدا دەکرێت، سەرئەنجامیش، جێگەیان دۆزەخە، ئای کە شوێنێکی خراپە.

بەڵێ ئینجا کەگشت خەڵکی گەڕانەوە بۆلای خوای تاك و تەنها لە دوارۆژدا، ئەوکەسانەی لە دونیا ڕێبازی ئیسلامیان ون کردبوو لەپێناو خۆشی ژیانی کەمی دونیا، ئەوکاتە بەکوێری حەشر دەکرێن لەبارەگای خوای گەورە.

﴿وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ﴾[2]. واتە: لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشریان دەکەین.

---

[1] - سورەتی الرعد ئایەتی (١٨).

[2] - سورەتی طه ئایەتی (١٢٤).





ئەو کەسانە لە دونیا لەناو خۆشی و نازو نیعمەت بوون چاویان ساغ و سەلامەت بوو کوێر نەبوون، بەڵام لەئاست حەق و ڕاستی کەرو کوێر و نابیانا بوون بەرنامەی ئیسلامیان پشتگوێ خستبوو.

بۆیە بە خوای گەورە دەڵێن: بۆ بەکوێری لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکەی لەکاتێدا لەدونیا چاومان بێ کێشە بوو!

﴿ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴾[1]. واتە: ئەو کەسە دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ بەکوێری حەشرت کردم خۆ من کاتی خۆی چاوساغ و بینا بووم.

بەڵێ لە دونیا هیچ کێشەی نەبوو لەبینین، بەڵام ئاست حەق و ڕاستی کوێربوو، ڕقی لەبەرنامەی خوای گەورە بوو، موسوڵمانی خۆش نەدەویست دژایەتی ئەکردن، ئینجا خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە ئەمرۆکە منیش ئێوە لەبیر دەکەم .

﴿قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ﴾[2]. واتە: لە وەڵامدا خودا دەفەرموێت: تۆ ئا بەو شێوەیە بوویت کوێر بوویت لە ئاستی ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەدا کاتێک لە دونیا پێت ڕادەگەیەنرا، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیر کراوت لەگەڵدا دەکەین.

ئینجا خوای گەورە پاداشتی ئەوکەسانەی لە دونیا پشتیان لەبەرنامەکەی کردبوو، کاریان دژایەتی بەرنامەی ئیسلام بوو بەبێ بڕوایی و لەکاری حەرام و خراپەکاری خۆشترین کاتیان ئەبردە سەر بەدرێژای ڕۆژ و شەو تەنها کاریان ئیهانە و رابواردن بوو بە پارەوە سەروەتی حەرام دەژیان سزای سەخت خەڵات و پاداشتیانە.

---

[1] - سورەتی طه ئایەتی (١٢٥).

[2] - سورەتی طه ئایەتی (١٢٦).





﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ﴾[1]. واتە: ڕۆژێك دێت ئەوانەی کەبێ بڕوان بەرەو دۆزەخ دەبرێن و نیشانیان دەدرێت و پێیان دەوترێت: هەرچی خۆشی و شادیەکتان هەبوو لەژیانی دونیاتاندا بەئارەزووی خۆتان ڕاتان بوارد، کەوابوو ئەمڕۆ ئیتر نۆرەی ئەوەیە کەسزای خەجاڵەتی و ڕیسوایی بدرێنەوە، بەهۆی ئەوەی کەلووت بەرزیتان دەکرد لەزەویدا بەناحەق و بەهۆی دەرچوونتان لەسنوور و فەرمانی خودا.

بۆیە ئەی بەندەکانی خودا تاکو لە ژیانین نەمردووین فرسەتە بابگەڕێنەوە بۆ لای خودا، تاکو گەنجین توندو تۆڵین پیرنەبووینە هێزمان هەیە بابەندەی خودابین بۆ ئیسلاممان تێبکۆشین و بمرین.

بادواتر پەشیمان نەبین لەقیامەت تاکو خودای گەورە بمان گەڕێنێتەوە بۆدونیا کاروکردەوەی چاکە بکەین، چونکە گشت کەسێك ئەوکاتە پەشیمانەو داخ لەدڵە لەو کاتەی لە دونیا لەدەستی چوو لەوەی لەدەستەی خوداناس و موسوڵمانەکان نەبووە.

﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ﴾[2]. واتە: پەروەردگارا لە ناو ئاگری دۆزەخ و سزاکەیدا دەرمان بهێنە ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ گومڕایی ئەوە ئیتر دیارە کە ئێمە کەسانێکی ستەمکارین.

بەڵێ لەتاو ناخۆشی و ئەزیەت و ئازاری ئاگردا دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ دونیا تاکو دووبارە بۆ خوای گەورە بژیت، بەڵام ساقیت بوونی قیامەت یەك جارە و دەوری دووەمی نیە وەك دونیا چۆن قوتابییەك کاتێك لەپۆلەکەی دەرناچێت و ساقیت ئەبێت، لەغەمان بڕیار ئەدات بۆساڵی داهاتوو خۆی ئامادە بکات گشت هەوڵ و ماندوبوونی بخاتە گەڕ، تاکو دەرەجەی زۆر بەرز بەدەست بێنێت دەربچێت بۆقۆناغی تر بگاتە ئامانجەکەی.

---

[1] - سورەتی الاحقاف ئایەتی (٢٠).

[2] - سورەتی المومنون ئایەتی (١٠٧).





بەڵام لە دوارۆژ وانیە چونکە خوای گەورە گشت شێکی بۆ روونکردینەوە، ئەمە چاکە و خراپە بەکردنی ئەچیتە بەهەشت، بەوازهێنان ئەچیتە ئاگری دۆزەخ.
بۆیە موسوڵمانی ژیر و ئاقڵ دەبێت زۆر جوان بیربکاتەوە لەسەرەنجامی دوارۆژی خۆی تاکو سەرفرازی بەدەست بێنێت بە پابەندبوونی بەئیسلام و جێگربوونی، ئینجا خوای گەورە وەڵامێکی جەرگبڕی زۆر رەق و ناخۆشی خراپەکاران ئەداتەوە لەسەر ئەو داواییەیان کە دووبارە بیانگەڕێنێتەوە بۆ دونیا.
﴿قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾[1]. واتە: خوای گەورە لە وەڵامیاندا بە تووڕەییەوە دەفەرموێت: بێ دەنگ بن و دەمتان داخەن، قسەشم لە گەڵدا مەکەن.
بەڵێ خوای گەورە زۆر تورەیە لە خراپەکاران ئەوانەی لە دونیا زوڵم و ستەمیان ئەکرد، تەمەنێکی زۆری پێ بەخشین لە دونیا هیچ کاتێك بیری نەئەکردەوە لەگەڵ نەفسی خۆی بارێگای راست بگرمە بەر وازبێنم لەگومڕای و زوڵم و ستەم و خراپەکاری.
بۆیە خوای گەورە ئەفەرمووێت:﴿ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾[2]. واتە: ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێ نەبەخشین؟ ماوەماندا بژین ئەوەی بیەوێت بیرێك بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە؟! بێدارکەرەوەشتان بۆ هات، بۆیە پێیان دەوترێت: کەواتە دە بچێژن سزای دۆزەخ، چونکە ستەم کاران هیچ پشتیوانێکیان نیە.
رەحمەتی خودات لێبێت، بزانە ئێمە کۆتا ئوممەتین، بەڕاستی هەمووشتێك تەواو بووە و گووتراوە، پێغەمبەران کۆتاییان پێ هاتووە، پێغەمبەر (محمد) کۆتا پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ کتێبە ئاسمانیەکان پەیام و رسالەکانی خوای گەورە هەمووی هاتوون بۆ مرۆڤەکان (قورئان) کۆتا کتێب و بەرنامەی خودایە یە بۆ مرۆڤەکان، خەڵکی هەمووشتیان بۆ ڕوون بوویەوە، ئەزانن چاکەو خراپە چین و کامەن،

[1] - سورەتی المومنون ئایەتی (١٠٨).
[2] - سورەتی فاطر ئایەتی (٣٧).





بەڵام زۆربەیان دەست هەڵناگرن و شوێن ڕێچکەو ڕێبازی گومڕایی و، شوێن نەفس و خۆشیەکانیان دەکەون.

﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾[1]. واتە: زۆربەی خەڵکی نازانن و بیرناکەنەوە.

بەڵێ زۆربەی خەڵکی سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە دەکەن سنوری قەدەغەکراو ئەبەزێنن، ئەوانەی بەڕاستی بۆ خودا دەژین لەهەموو کات و سەردەمێکدا کەمینە و کەم بوونە، بەڵێ زۆرینەی خەڵکی لەسەر ڕێگای گومڕاین بۆیە هیچ کات زۆرینەی خەڵکی هەڵت نەخەڵەتێنێت کەپابەندن بە ڕێگایەکەوە و لەسەر بیر و بۆچوون و فیکرێکن.

﴿ بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾[2]. واتە: نەخێر وانیە بەڵکو ئەوانە کەمێك تێ دەگەن لە ڕاستی فەرمانەکانی خودا.

کەوابو تاکو زووە ئەی بەندەی خودا باپەلە بکەین بۆ گەڕانەوە بۆ ڕێگای سەرفرازی کە ئیسلامە، با لەم دونیایە پەشیمان بینەوە پێش ئەوەی بمرین لە دوارۆژ سەرشۆڕ و زەلیل بین و پەشیمانی دامان بگرێت کە هیچ سودێکی نیە ئەوکاتی.

بۆیە با پەیمان بدەین لەگەڵ خودای خۆمان کەتاکو تەمەنمان ماوە لە دونیا، گشت جوڵانەوە و چرکەیەك لە ژیانمان بۆ غەیری ڕەزامەندی ئەو نەبێت و تەنها و تەنها بەس نیەتمان بۆ خودای پەروەردگار بێت بەدڵسۆزی، تاکو بۆ دواجار خۆشی نەبڕاوەی بەهەشتی فیردەوس بەدەست بێنین، بەئیزنی الله تعالی.

[1] - سورەتی الانعام ئایەتی (٣٧).
[2] - سورەتی الفتح ئایەتی (١٥).



## سەرەنجام هەر جیابوونەوەیە.!

ڕەحمەتی خودات لێبێت ئەی بەندەی خودا ئەوە بزانە هەرشتێك لە دونیا بوونی هەیە گشتی دروستکراوی خوای گەورەن، هەرچی لە ئاسمان و لەزەویدا هەیە، چیا، باران، بەفر، دار، بەرد، بێگیان و گیاندار هەموو موڵکی خودای گەورەن.

﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[1]. واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە و ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. پاشان خوای گەورە بڕیاریدا لە سەر زەوی مرۆڤ دروست بکات و بڵاویان بکاتەوە. ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ﴾[2]. واتە: بیریان بخەرەوە کە پەروەردگارت بە فریشتەکانی گوت: من دەمەوێت بەشەرێك، لە قوڕ دروست بکەم.

ئینجا خودای گەورە توخمی مرۆڤی لە دوو ڕەگەز (نێر) و (مێ) بەدیهێنا.

﴿فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ﴾[3]. واتە: ئینجا هەر لەو مەنی یە هەردوو جووت نێرو مێ ی دروست کردووە.

پاشان خودای کارزان مرۆڤەکانی کرد بەچەندان قەوم و زمان و لە زەویدا بڵاویکردەوە، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا﴾[4]. واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروستکردووە و کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان هەبێت و ژیان بە خۆشی بە ڕێب کەن.

---

[1] - سورەتی ال عمران ئایەتی (١٨٩).

[2] - سورەتی ص ئایەتی (٧١).

[3] - سورەتی القیامة ئایەتی (٣٩).

[4] - سورەتی الحجرات ئایەتی (١٣).





لەو دوو ڕەگەزەش کۆمەڵە خێزانێك كە، (باپیر، داپیر، باوك، دایك، برا، خوشـك)، پێکدێ، ژیان بەیەکەوە بەڕێ دەکەن، بەخۆشی و ناخۆشی و گریان و ناڵەو ئازار تاکو پیری و کۆتا تەمەن بەیەکەوە دەبن، بەنەخۆشـی یان بەهەر ڕووداوێك خودای گەورە ویستی لێبێت بەگەنجی بمرن، یان سەرەنجام كە پیر ببن و لەیەك دابڕێن و بمرن.
ئەبێ موسـوڵمان ئەو ڕاسـتیە بزانێت كە ژیانی دوای مردن كەبەهەشـتی نەبڕاوەی بێ کۆتاییە ئەو ژیانی ڕاسـتەقینەیە، نەك ژیانێك مردنی لەدووابێت، لەم دونیایە كەس دڵنیا نیە یانی دڵی ئارامبێ، هەمیشە ترسی مردن و جیابونەوەی هەیە لە ئازیزانی.
بۆیە لەم ژیانەی دونیا ئەگەر خاوەن گشت موڵك و سەروەت و سامانێك بیت هیچ سوودی نیە، ئەگەر تۆ ئیماندار نەبی و ئیسلام بەرنامەت نەبێت، چونكە تۆ كەمردی و هیچ شتێك لەگەڵت نایەتە ژێرگۆڕ، جگە لەو كاروكردەوەی كەبۆ خودای گەورە کردووتە بەنیازپاکی و دڵسۆزی.
عن أَنَس بْن مَالِكٍ (ﷺ)، قال: قَالَ رَسُـولُ اللَّهِ (ﷺ): (يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاَثَةٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى مَعَهُ وَاحِدٌ: يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عَمَلُهُ)[1]. واتە: لە (ئـەنـەسـی كوری مـالیكـەوە) (ڕەزای خوای لێبێـت) گوتی: پێغـەمبـەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: مردوو كاتێك دەمرێت سێ شـت بەدوای دەچن بۆ قەبرسـتان دووشـت دەگەڕێنەوە یەكیان دەمێنێتەوە ماڵ و خزمەكانی وەكردەوەكانی، خزم و كەسـەكانی و دەگەڕێنەوە، تەنها كارو كردەوە و عەمەلی لەگەڵی دەڕوات.
لەدونیا ئازیزترین و خۆشەویسترین كەسـت هەبێ ڕۆژێك دێ كۆتایی بە پەیوەندیتان دێ و هەر كەسـەو تەنها ئەمێنێتەوە، بۆنموونە: دایكانێك هەن ئێسـتا بەتەنها ماونەتەوە لەژووره سـارد و سـڕەكەی، كە كاتی خۆی پێشـتر گەنج بوون دوایی بوو بەدایكی منـداڵان، هێـدی هێـدی لـەگـەڵ ڕۆژگـاردا تـاڵـە مووەكـانی سـپی دەبوو، كوڕەكـانی هەریەكەیان چوونە سەرماڵی خۆیان و ژنیان هێناو لێك جیابوونەوە،

[1] - (رواه البخاري، ژمارەی فەرموودە: (٦٥١٤)، ومسلم، ژمارەی فەرموودە: (٢٩٦٠).




پاشـــان کچەکانی شـــوویان کرد هەریەکەیان چوونە شـــارێك لەدایکی غەم خۆریان دوورکەوتنەوە، دایکی واهەیە ئێســـتاکە کەس نیە بیباتە دکتۆر بەئازارەکانی دەناڵێنێ، پیاوی نەماوە و کورەکەشـــی خۆی کوشـــتوە یان بە دەعم و ڕوداووی ســـەیارە گیانی لەدەســـتداوە، کچەکانی چوونەتە تەمەن لەبەر منداڵ و ئازار و کێشـــەی خۆیان ئاگایان لەدایکی غەریبیان نەماوە.

بۆیە ئەی بەندەی خوا ئێســـتاکە تۆ لەگەڵ باوك و دایك و خوشـــکەکانتی لەیەك ماڵ بەخۆشی ژیان بەڕێ دەکەن، ئەوەبزانە ڕۆژێك هەردێ لەیەك جیادەبنەوە، هەریەکەتان دەچنە ماڵی غەریبی ژێر خاك و خۆڵ کە قەبری تەنگ و تارە، بۆیە لە دونیا دڵت بەچی خۆش دەکەی بە باوك، برا، دایك، خوشـك، قەوم و عەشیرەت، ناوبانگ و سـوڵـــتە، جوانی، هاوڕێ دڵســـۆزەکەت، هاوســـەرەکەت، بازرگانی و کۆمپانیاکەت، ئەمانە هیچیان هەتا ســـەربوونی نیە و کەتۆ دڵتی پێ خۆش بکەی بۆهەتایی بەمانەوەیان چونکە گشتی کاتیین و لەیەك دادەبڕێن،

﴿مَا عِنْدَكُمْ يَنْفَدُ وَمَا عِنْدَ اللَّهِ بَاقٍ﴾[1]. واتە: هەر چی لای ئێوەیە لەدونیا هەرچەندە زۆربێ هەر کۆتایی دێت و تەواو دەبێ و نامێنی بەڵام ئەوەی لای خوایە لەبەهەشـــتدا هەر ئەمێنێتەوە کۆتایی نایەت و هەمیشەیە.

بەهەرشـــێوەیەك بێت پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان کاتین و بۆماوەیەکە و کۆتایی پێدێ هەتا سەرنیە، لەوانە چەندین هۆکار بێتە ڕێ بۆ لەیەك جیابوونەوە، بۆنموونە: گەنجە بەخۆشـەویسـتی ژیانی هاوسـەری پێك دێنێ، سـەرەتا بەقسـەی گەورەو بەڵێن بۆ کچە تاکو ڕازی دەکات، کە چوونە نێو ژیانەوە، لەوانە لەسـەر شـتێکی کەم ژیانیان تاڵ بێ و لەیەك جیابنەوە، ژنەکە لەزانکۆ بووە هاوپۆلەکەی لەبازاڕ ئەوی بینیوە لەگەڵ پیاوی سڵاوی ڵیکردووە، پیاوەکەی دڵ پیسی لێکردووە، بۆتە کێشە و لەیەك جیابوونەتەوە.

[1] - سورەتی النحل ئایەتی (٩٦).





یان کچە لەسەر ئەوەی پیاوی بەڵێنی پێدابوو خانووی بۆدەکات دوور لەماڵی باوکی بەڵام سەرەتا لەماڵی باوکیان بن، دوواتر خانووی بۆناکات بەهەر شێوەیەك بێت، دواتر کچە دەیکاتە کێشەو گەورەی دەکات لەسەر خانوو، ئەمانەو سەدان هۆکاری تر هەیە بۆ لێك دابڕان و جیابوونەوە.

یان دووهاوڕێ لەمنداڵیەوە پێکەوەبوونە تا گەورەبوون زۆربەکتریان خۆشویستووە بۆکاتێکی کەم لەیەك دانەبڕاوون، بەڵام ماڵی یەکێکیان باردەکەن بۆشار وولاتی ترو لەیەك دووردەکەونەوە.

بۆیە ڕەحمەتی خوات لێبێت مەبەستمان ئەوەنیە ئەم ژیانەی دونیا بێ نرخ بکەین و بەتەنها بژیت دووربکەویتەوە لەگشت خەڵکی گۆشەگیربیت، بەڵکو ئێمە مەبەستمان ژیانی دونیا جێگای ئومێد و هیوا درێژی نیە تۆ لەپێناو دونیا خوا لەبیربکەی، ئیسلام و بەرنامەکەی پشتگوێ بخەی و دژایەتی بانگەوازی پێغەمبەر(ﷺ) بکەی کەتاکە ڕێگەو ڕێبازە دەستگرتن پێیەوە سەربەرزو سەرفرازت دەکات.

بۆیە ئێمە مەبەستمانە بەهۆی ئەم ژیانەی دونیاوە کە تێدا ژیان دەبەینە سەر هەوڵبدەین گشت کاروکردەوەیەکمان بۆخوادابێ، گشت جوڵانەوە و هەنگاوێك کەبە بێ ئەڕۆین بۆڕەزامەندی خوابێت، هەرپەیوەندیەك لەگەڵ دەوروبەرمان بۆخوابێ بەبێ بەرژەوەندی دونیایی، هەرشتێك ئەیبەخشین بەنهێنی و ئاشکرا بۆخوای گەورەبێ، چونکە لە دونیا بۆ خوا ژیان دەبێتە هۆی بە دەستهێنانی بەهەشت و ڕەزامەندی خوای گەورە، ﴿تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[1] واتە: ئەو بەهەشتەیە کە پێتان دراوە بەهۆی ئەو کارو کردەوانەیە کە لە دونیا بۆ ڕەزامەندی خوا ئەنجامتان دەدا.

بۆیە دەبێ لەژیانی دونیا تاکە شتێك دڵمان پێخۆش بێت ئیمان و ئیسلام و عەقیدەمان بێت کەبەڕاستی لەگەڵ خوای خۆماندابین، گەرنا دونیا هەموو هی تۆ بێت نرخی باڵە مێشولەیەکی نیە لای خودا،

[1] - سورەتی الاعراف ئایەتی (٤٣).





کەتۆ بۆئەو نەژیای چ سوودی هەیە سەروەت و سامانی دونیا، بۆیە هیچ گرنگ نیە دڵ خۆشکردن بەم دونیایە، ئەگەر دونیا نرخ و قەدری هەبا لە لای خوای گەورە ئەوا کافرو بێ باوڕەکان وا بەخۆشی و ڕابواردن تیایدا نەدەژیان، دونیای گشتی ئەخستە خزمەت ئەوانەی فەرمانداری ئەودەکەن و ملکەچی یاساکەی دەبن، نەی دەهێشت کافرەکان ئاوا بەخۆشی بژین و ڕابوێرن، خۆشی دونیا تەنها بۆ موسوڵمانان دەبوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ الله جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَاسَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ)[1]. واتە: ئەگەر دونیا نرخی باڵە مێشولەیەکی هەبووایە لای خودای گەورە ئەوا قومە ئاوێکی لێ نەئەدا بەکافران.

بۆیە هەریەکێك لە ئێمەی موسوڵمان دەبێ بۆخۆمان هەوڵ و تێکۆشان بکەین لەژیانی دونیا بۆ ڕەزامەندی خوای کارزان، چونکە گەر ئێمە بۆخودا کاروکردەوەمان ئەنجام نەدا هیچ پاداشتی کەسمان بۆنایەت و تاوان و خراپەشمان بۆکەس ناچێت لەدوارۆژدا. ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ﴾[2]. واتە: هیچ گوناهبارێکیش گوناهی کەسانی تر هەڵناگرێت (لە قیامەتیشدا) ئەگەر گوناهبارێك هاوار لە کەسێك بکات تا باری سەرشانی سوك بکات هیچ باری سوك ناکات هەتا ئەگەر خزم و خۆشەویسترین کەسی بێت.

کەوابو دەبێ خۆمان هەوڵ و تەقەلاو ماندووبون بکەین بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا، لەئامادەباشیدابین بۆ ڕۆژێك کە هەرکەسەو سوود و زیانی بۆخۆی هەیە.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِ شَيْئًا﴾[3]. واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن لە ڕۆژێک بترسن کە باوک فریای ڕۆڵەی ناکەوێت، ڕۆڵەیش هیچی لە دەست نایەت کە بۆ باوکی ئەنجامی بدات.

[1] - ( اخرجه ترمذی، ژمارەی فەرموودە: ( ٢٣٢٠).
[2] - سورەتی فاطر ئایەتی (١٨).
[3] - سورەتی لقمان ئایەتی (٣٣).




بەڵێ بزانە لە ڕۆژی قیامەتیش کاتێ حەشروحیساب دەست پێدەکات لە بارەگای خوای پایەبەرز هیچ شتێکی دونیا لە خزم و قەوم و پارەو ناوبانك سوودی بۆ ئێمە نیە، نەباوك و دایك، نەهاوڕێ و خۆشەویستێك، جگە لە کاروکردەوەی چاکە نەبێت.

﴿لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ﴾[1]. واتە: هەرگیز نە خزمانتان و نە مندالانتان سوودتان پێناگەیەنن و فریاتان ناکەون، لەرۆژی قیامەتدا، کە ئێوە لە بەر ئەوان دۆستایەتیان دەکەن لەرۆژی قیامەتدا خودا لێکتان جیا ئەکاتەوە بڕوادارو بێ بڕوا هەرکەسە ئەنێردرێت بۆجێگای شیاو بەخۆی ئەگەرچی کەس و کاریشتان بن.

بەڵێ لە دوارۆژیش هەموو کەس تەنها غەمی نەفسی خۆیەتی کە ڕزگاری بێت لەسزاو ناخۆشی ئاگری جەهەنەم، خودابمان پارێزێ .﴿يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا﴾[2].

واتە: ڕۆژێك دێت کە هەموو کەس غەمی خۆیەتی، بەرگری لە خۆی دەکات.

بەڵێ خۆی ڕزگاری بێت گوێ بە خزم و کوڕ و کچەکانی نادات، تەنها غەمی خۆیەتی تا ڕزگاربێ لە سزای دۆزەخ خودا پەنامان بدات، کەسی تاوانبارو بێباوەڕ ئامادەیە منداڵەکانی خۆی هەموو بکات بە قوربانی نەفسی خۆی تاکو بەس ڕزگاری ببێت لەسزای دووارۆژ، ﴿يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ﴾[3]. واتە: تاوانبار و گوناهکار ئاوات دەخوازێت کەئەگەر بکرێت بۆدەربازبوونی خۆی لەسزای ئەو ڕۆژە هەموو کوڕەکانی بکاتە قوربانی خۆی.

کێ ئارەزوو دەکات لەو ڕۆژەدا خێزان و کوڕ و کچەکانی بخاتە نێو ئاگری سوتێنەر لە پێناو خۆیدا! تا بەس خۆی ڕزگاری بێ لەسزا، لەکاتێکدا لەدونیا زۆر ماندوبوو بە خزمەتیکردنیان تاکو گەورەی کردن،

[1] - سورەتی الممتحنة ئایەتی (٣).

[2] - سورەتی النحل ئایەتی (١١١).

[3] - سورەتی المعارج ئایەتی (١١).





ئینجا لە قیامەت دەیەوێت لەپێناو خۆیدا بیانخاتە ئاگر چونکە لەدونیا پشتی لەبەرنامەی خوا کردبوو بەڵام هیچ سوودی نییە لەو ڕۆژە گەر هەموو دونیا هی تۆ بێت ببەخشی تابەس ڕزگارت بێ ئەوە بێهودەیە.

﴿ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنْجِيهِ﴾[1]. واتە: بەهەرچی دانیشتوانی سەرزەویش هەیە ئەگەر بۆی بکرێت بیکاتە قوربانی خۆی، پاشان خوا ڕزگاری بکات.

بەڵام خوای گەورە هەمووشتێك ڕەت ئەکاتەوە پاداشتی هەرکەسەو بەپێی کردەوەکانی ئەداتەوە، جائەو کەسەی بۆخوا ژیا ئەوە پاداشتی بەهەشتە، ئەوەی بۆدونیا ژیا و ژیانی سەراپای دژایەتی خوای گەورە بوو سزای ئاگری بەدە، ئەگەر هەرچیش بدات لەپێناو خۆیدا تارزگاری بێت سوودی نییە، بۆیە خوای گەورە وەڵامیان ئەداتەوە.

﴿كَلَّا إِنَّهَا لَظَى﴾[2]. واتە: نەخێر... ئەو ئاواتانە هیچی نایەتەدی... بەڕاستی دۆزەخ ئامادەیەو بڵێسەدارە و داخ لەدڵە.

ئێستا زانیت حاڵی کەسی دونیا پەرستەکان چۆنە لەدوارۆژ، بۆیە لەو ساتەوە وەرن با پەیمانێکی پتەو بدەین لەگەڵ خوای جیهانیان بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت، تا لە ژیانین بۆخودا بژین فەرمانەکانی جێبەجێ بکەین لەخۆشی و ناخۆشیدا لەهەبوونی و نەبوونیدا، دڵنیابە گەر ڕۆژ و شەو ماندووش بین بەخودا پەرستیمان لەلای خوای گەورە وننابێت و بەهەدەر ناڕوات.

کەوابوو تاکە شتێك وابکات تۆ سەرفرازبی لەدونیا و قیامەت ئەوە خۆتیت بۆیە هەوڵ بۆ دوارۆژی خۆت بدە و غەمی لێ بخۆ، بزانە ڕەحمەتت لێبێت هەموو دونیا هی تۆبێت و گشت خەڵك لەپشتت بن ڕۆژێك هەر لێت جیادەبنەوە و بەجێت دێڵن و جێیان دەهێلیت، بۆیە دڵت تەنها بەئیمانەکەت خۆشبێ کەتۆ یەکخواپەرستی و بەتەنها بەندەی خودای گەورەیت،

[1] - سورەتی المعارج ئایەتی (١٤).

[2] - سورەتی المعارج ئایەتی (١٥).





گوێ بەهیچی تر مەدە کەتۆ خاوەنی هیچ شتێك نیت لە دونیا، نە سەروەت وسامانی زۆر و خانووی چەندین قات، و نە کۆمپانیاو شەریکە، نە سەیارە و بازرگانی، ئەمانە هیچیان سوودی نیە هەمووی دەڕوات و کاتین.

﴿فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[1]. واتە: ئینجا هەر شتێك بە ئێوە بەخشراوە، لەزەت و بەهرەی ژیانی ئەم دونیایەو، زۆر بەزوویی ئەڕوات و نامێنێتەوە.

بەڵێ تاکە شتێك بمێنێتەوە پشتت لێ نەکات لە دوارۆژ ئیمان و کاروکردەوەی چاکەی تۆیە کە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بەدڵسۆزی کردووتە، دڵنیابە خوای پەروەردگار لەبری ئەو ماندوبوونەی کە گشت تەمەنت بۆڕەزامەندی ئەو بوو بە باشترین شێوە پاداشتت دەداتەوە.

﴿وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾[2]. واتە: ئەو پاداشت و بەخششەی لای خوایە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، وە بە پەروەردگاریان پشت ئەستوورن، باشترو بەردەوام ترە.

بۆیە ڕەحمەتت لێبێت ئەی بەندەی خودا گەر دونیا گشتی پشتیان لێکردی و بەتەنها مایتەوە، ئەوە دەست بە قورئانەکەی خوای گەورەو و سوننەتەکانی سەروەرمان بگرە، ئەوە دڵنیابە ئیمانەکەت گرانبەهاترین سەروەت و سامانتە لە دونیا و دوارۆژت و دڵت خۆشبێ سەرەنجامیشت بەهەشتە، بەئیزنی الله تعالی.

---

[1] - سورەتی الشوری ئایەتی (٣٦).

[2] - سورەتی الشوری ئایەتی (٣٦).





# لە کۆتایی

هەموو سوپاس و ستایشێك بۆ خوای گەورە، پاشان درود و سڵاو بۆ سەرکردەو پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) و سەرجەم ڕێبوار و تێکۆشەرانی ڕێگای پیرۆزی ئیسلام.

هیوادارم ئەم نووسینەی بەردەستان کە لێرەوە هاتینە کۆتایی، بووبێتە هۆی بەرچاوڕوونیمان بۆ زیاتر نزیك بوونەوە لەخوای گەورە، و ناسینی حەق و ڕاستی و پشتکردنمان لە مەبەستەکانی دونیا و خۆیەکلاکردنەوە بەدڵسۆزی بۆ خوای گەورە و هەنگاونانمان بەرەو ڕێگای سەرفرازی ئیسلام کەتێدا گشت خۆشییەکی ڕاستەقینەی دێنێتە بوون لە دونیا و دواڕۆژ.

بەڕاستی ئەی بەندەکانی خودا موسوڵمانی ژیر ئەو کەسەیە کە لەڕاستی ئەم ژیانە تێ دەگات و پەند و عیبرەت وەردەگرێ لە ژیانی خەڵکانی پێش خۆیەوە، کە ئێمە کۆتا ئوممەتین هەزاران پێغەمبەر هاتوون بۆ ئوممەتانی پێش ئێمەوە کە هەموویان کۆتاییان پێهاتووە، و پێغەمبەرەکان (علیه السلام) گشتیان وەفاتیان فەرمووە و گەڕاونەتەوە لای خوای کارزان، ئەرکی خۆیان جێبەجێ کرد و مرۆڤایەتیان بەپەیام و یاسای خوای گەورە ئاگادارکردەوە، زۆرێك لە مرۆڤەکان باوەڕیان هێناو زۆرێکیش دژیان وەستانەوە، ئەوانەی دژیان وەستان تاکو دونیا ماوە بوونە پەند و وانە بۆ مرۆڤایەتی لەنموونەی: فیرعەون و هامان و قاروون و ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب..هتد و سەرجەم سەرانی کوفر بە درێژای مێژوو تەنها ڕوو ڕەشیان بۆ مایەوە لەبەرامبەر دژایەتیان بۆ خودای گەورە و دین و بەرنامەکەی، بەڵام ئەوانەی بۆ خودا ژیان ناویان هەر بەرز ماوە خەڵکی شانازیان پێیەوە دەکەن، بۆیە ئەم پەیامبەرانە زۆرێك موعجیزەو بەڵگەیان لەلایەن خوای گەورە بۆمرۆڤەکان هێناوە تاکو بڕوابێنن بەخوای تاك و تەنها و کافربن بەهەرچی خودای تری باتڵ و ناڕەوا هەیە لەسەر زەوی دا.





ئینجا وەك كۆتا ئوممەت پێغەمبەرێکی بۆناردین، بەموژدەدەر بەوەی هەرکەس موسوڵمان بێت و تەشریع و ڕێسای ئیسلام بەرنامەی بێت بەهەشتی بۆ دەبێت، و ترسێنەریشە بەوەی هەرکەس پشت لەبەرنامەکەی بکات دژایەتی بکات ئاگردەبێتە شوێنی پەنا بەخوای گەورە.

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾[1]. واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە، مەگەر بۆ ئەوە نەبێ کە بۆ هەموو خەڵکی ببیتە مژدەدەرو ترسێنەر. بۆیە ئێمە ئاگادارکراوینەتەوە هەموو شتێکمان بۆڕوون بۆتەوە دەزانین حەق و ڕاستی چیە و خراپە و تاوان و ڕێگای گومڕایی کامەیە.

ئایە کاتی ئەوە نەهاتووە ئەی براکەم خوشکی من خۆمان تەسلیم بکەین بە خوای گەورە بەڕاست و دروستی بۆ ئەو بژین تاکو لە دواڕۆژ بە چاکترین شێوە پاداشتمان بداتەوە؟ بۆیە با هەموو هەوڵ و کۆششمان لەژیانی دونیا بۆ ئەوە بێت خوای گەورە لێمان ڕازی بێت و لە دواڕۆژیش بگەینە خزمەت خۆشەویستمان پێغەمبەری ئازیز (ﷺ)لەسەر حەوزی (کوثر) با لەو کەسانە نەبین کە دوورئەخرێنەوە.

هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان دەفەرموویت: هەر دووربن و هەر دووربن.

کاتێك پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) پێش وەفاتی سەردانی گۆڕستانی بەقیع دەکات، دەفەرمووێ: سڵاوتان لێبێت ئەی ماڵی قەومی ئیمانداران، ئێمەش ئەگەر خوا بیەوێت پێتان دەگەین، حەزم دەکرد براکانم بدیتبایە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبێت) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی ئێمە برای تۆنین؟ فەرمووی: بەڵکو ئێوە هاوەڵمن، براکانمان ئەوانەن کەهێشتا نەهاتوون، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری ئازیز (ﷺ)چۆن کەسانێك دەناسیتەوە لەئوممەتت کەهێشتا نەهاتوون؟

فەرمووی: ئەگەر پیاوێك ئەسپێکی کوێتی (ناو چاوو دەست و پێ سپی) هەبێت لەناو کۆمەڵێك ئەسپی ڕەشی تۆخدا بێت، ئایا ئەسپەکەی خۆی ناناسێتەوە؟

[1] - سورەتی السبا ئایەتی (٢٨).





گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دە ئەوانیش ڕۆژی قیامەت بەناوچاوی جوان و دەستوپێی سپییەوە، بە شوێنەواری دەست نوێژەوە دەیان ناسمەوە، دێن و منیش پێشیان دەکەوم بۆ سەر حەوزەکە، ئاگاداربن پیاوانێك دوور دەخرێنەوە لە حەوزەکەی من وەکو: چۆن وشتری تار دوور دەخرێتەوە، منیش بانگیان دەگەم: ئاگاداربن وەرن، بەڵام دەگوترێت: ئەوانە لەدوای تۆ گۆڕاون، منیش دەڵێم: هەر دووربن و هەر دووربن.[1]

بزانن براو خوشکانم خۆشەویستمان چ حسابێکی بۆ ئێمەی بێ وەفا کردووە بەڵام توخودا ئێمە واین بەرامبەر بەو وەفاو سۆزەی بۆ ئێمەی هەیە، زانیتان پێغەمبەری خودا (ﷺ) چەندە بە پەرۆشە بۆبینینمان؟ ئایا ئەو پەرۆشیە بە پەرۆشیمان بۆی نەگۆڕینەوە؟

بۆیە پێویستە کە خۆشەویستی ئەو پێشەوایە ئامانجێکی سەرەکی بێت لە ژیانی هەموومانداو سەرپێچی نەکەین، تاوەکو یەکێك بین بەئیزنی خوای گەورە لەو سەرفرازانەی لەسەر حەوزەکە لەئاوی سازگار دەخۆنەوە.

بۆیە ڕەحمەتت لێبێت با ئەم پەرۆشیەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەگۆڕینەوە بە خۆشیەکی کەمی ژیانی دونیا پەنا بەخودا، لەو کەسە دوورخراوە سەر شۆڕانە بین کە ڕێگری دەکرێن دوور دەخرێنەوە لە حەوزەکە.

کەوابوو تکادەکەم ئەی بەندەکانی خودا، بابگەڕێینەوە بۆ لای خوای گەورە دەست بە یاساو بەرنامەکەیەوە بگرین بۆ ژیانێکی کاتی و کەمی دونیا دینەکەمان نەدۆڕێنین، بەیانی لەژێر قەبر تەنها پرسیاری دینەکەمان لێدەکرێ بۆیە باخەمی ئیسلامەکەمان بێت و کاروکردەوەی چاکە زۆر بۆ دواڕۆژمان بەڕێ بکەین و گەنجیمان پیربکەین لە ئیسلام و سەربەرزانە بگەڕێینەوە لیقای خوای گەورە تا جێگاو شوێنی ئەبەدیمان دوور لەناخۆشی و ئازاری دۆزەخ بەهەشتی پڕ لەنازو نیعمەت بێت.

---

[1] -(صحيح المسلم، ژمارەی فەرمووده: (٢٤٩).





پاداشـتی هەول و تێکۆشـان و ماندووبونمان بەنووسـینی ئەم چەن ئامۆژگاریيە کەمە تـەنها لـەخوای گـەورەمـان دەوێ و چـاومـان لـەرەحم و سـۆزی ئـەوە، پێویسـتمـان بەسوپاس و دەست خۆشی هیچ بەندەیەکی خودانیە.

﴿لَا أَسْـأَلُكُمْ عَلَيْـهِ مَـالًا إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾[1]. واتـە: لـە بری ئـەم بـانگـەواز و ئامۆژگاریانەم داوای هیچ ماڵ و خەرجیتان لێناکەم، کرێ و پاداشتم تەنها لای خوایە.

نازانم بەچ زمانێك بنووسـم کە چۆن سـوپاسـی خوای گەورە بکەم کەئەم بەهرەی پێ بەخشـیوم تاکو لەخزمەت دینەکەی بم و نووسـینەکانم بیکەمە پەرژین بۆ پاراسـتنی سنوری ئیسلام بەرامبەر ناحەزانی تاکو گیانم تێداماوە.

زەلیلی و نەزانینی خۆم بەملکەچی بۆ لای خوای گەورە بەرزدەکەمەوە کەهەر خۆی شـایەنی گەورەی و سـوپاسکردن و بەندایەتی بۆ کردنە، هەر چاکەیەکی پێ بەخشـیوم هەمووی لەرەحم و سۆز و میهرەبانی خۆیەتی بۆ ئەم بەندە هەژارو داماوە، ئەگەر سۆز و دینەکەی خودای گەورە نەبوایە کەسـێکی گومڕاو سـەر لێشـواو خەسـارت مەند دەبووین بەڵام زۆر شوکر و سوپاس بۆخودای گەورە دڵی پەیوەستکردین بەئیسلام.

داواکارم لـە خوای گـەورە بـە نیـازێکی پـاك و بێگـەرد ئـەم کارەمـان لێ قبوڵ بکات و بمانکات بەیەکێك لەبەندە ڕاستگۆکانی کەبەبێ لێپرسینەوە دەیانخاتە بەهەشتی پان و بەرین و لەگەڵ سەرنج موسوڵمان لەهەر کوێیەکی ئەم زەویەدا هەن.

زۆرسـوپاسـی هەموو ئەوبراو خوشـکانەم دەکەم کە ئەرکی چاپەکەیان گرتە ئەسـتۆ ئەوانەی گەر بە کەمترین بڕە پارە هاوکارمان بوون و ئەوانەش کە هاندەرو پشـتیوانم بوون لەوەی لەنووسـینەکانم بەردەوامبم و بڵاویان بکەمەوە خوای گەورە بە باشـترین شـێوە پاداشـتیان بداتەوە، خوای پەروەردگار هەمووەمان بەیەکەوە کۆبکاتەوە لە بەهەشتی فیردەوس.

---

[1] - سورەتی هود ئایەتی (٢٨).





داواکارم لەخوێنەرانی ئەم کتێبە وەکو وەفایەك بۆ بەندەی هەژار (خاکی) لەدوعاکانیان لەیاد نەکەن و ناوم بێنن لەنزاکانیان و داوای لێخۆشبوونم بۆ بکەن لەخوای گەورە.
وەهەر هەڵەو کەم وکورتییەك کە بەرچاوتان کەوت چاوپۆشـیم لێ بکەن، چونکە هەرخودایە کامل و بێ کەم و کورتی.
بۆ هەر پێشنیارو رەخنەو تێبینییەك دەتوانن بەم ئیمەیڵەی خوارەوە، بۆم ڕەوانە بکەن، یاخودسەردانی ئەکاونتی فەیسبووکم بکەن بەناونیشانی

Email:abdullamahdihaji@yahoo.com
www.faecbook.com/عبدالله خاكى

تێبینی: بەندە بەرپرس نیە لەوەی هەرکەسـێك بڵاوی بکاتەوە مافی بڵاوکردنەوەی بۆ هەموو موسـوڵمانێکە بەمەرجێك لە ژێر ناوی هیچ حیزب و گروپ و تاقمێك بڵاوی نەکاتەوە تەنها بۆ خوا بڵاوی بکاتەوە.

﴿ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾

**خوێنەری بەڕێز: داوام وایە دوای خوێندنەوەت ئەم کتێبە بیدەی بە هاوڕێی و ناسیارەکانت تاکو بۆت ببێتە خێری نەبڕاوە بە ئیزنی خودای گەورە.**





## سەرچاوەکان:

١. قورئانی پرشنگدار.

٢. تەفسیری ڕامان ........ شێخ احمد کاکە محمود.

٣. تەفسیری ئاسان..............بورهان محمد امین.

٤. پوختەی تەفسیری قورئان......مەلا محمد مەلا صالح.

٥. فەرمووده هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم.....حەمە کەریم عبدالله.

٦. سەحیحی موسلیم......نوری فارس حمه خان.

٧. ژیانی ئازیزمان.... حبیب محمد سعید، چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٧.

٨. خەلیفەی نوێخوازو چاکسازعمری کوری عبدالعزیز، دکتۆر علی محمد الصلابی، وەرگێڕانی: عومەرتۆفیق الخطاط، چاپی دووەم ساڵی ٢٠١٣.

٩. بگە بەکارو انی ساڵحان..عومەرتۆفیق الخطاط، چاپی دووەمی ساڵی ٢٠١٤.

ئەمانەو کۆمەڵێك سەرچاوەی ترکە لە پەراوێزی لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا ئاماژەیان بۆ کراوە.





## ناوەرۆك







لەم کتێبەدا دەچینە خزمەت کێشە و ناخۆشییەکانی ئەم سەردەمەی ئێستامان، کە مرۆڤەکان تێی کەوتوون، نازانن، هانا بۆ کوێ ببەن، لەبەر زۆری غەم و ئازار و ناخۆشییەکانی ڕۆژگار، بۆیە وەکو بەندەیەکی دڵسۆزی ڕێبواری ڕێگای پیرۆزی ئیسلام گەڕاین لە هەموو کون و قوژبنێکەوە بە هەوڵ و ماندوبوونێکی زۆرەوە؛ تاوەکو دەرمانێک بدۆزینەوە بۆ ژان و ئازاری خەڵک، بەڵام بەماندویی و شەکەتیی زۆرەوە هیچ چارەسەرمان نەدۆزییەوە، بۆیە بەسەرشۆڕی و ناچارییەوە گەڕاینەوە بۆ لای چاکترین پزیشک لە مێژووی مرۆڤایەتی، کە پێغەمبەری خودایە (ﷺ) و لە باشترین نەخۆشخانە، کە ئیسلامە، بۆ چارەسەر و بە دەرمانی قورئان و سوننەت. ڕێنماییەکانی پزیشکی پێشەوا بخەینە ڕوو بۆ موسوڵمانان، تاوەکو چارەسەری کێشەکانیانی پێ بکەن، دووبارە بەتووندوتۆڵی هەستنەوە سەر پێ و بەهێز و ورە و ئیمانێکی پتەو بژین بۆ خوای گەورە، تاوەکو لە دنیا بەختەوەر و دڵخۆش بن، پاشان بەهەشتی پان و بەرین ببێتە جێگای مانەوەی هەمیشەییان.